


- ناوی گۆڤار : ئەکادیمی.
- بلاّوکراوەی ئەکادیمیای کوردی.
- سەرپەرشتیی هونەری و بەرگ : محەمەد زادە.
- ڕێکخەری بابەتەکان : شیلان جەلال ـ عەبدولحەمید عەزیز ڕەسولّ ـ زاهیر عومەر وەلی .
- هەلّەچنی : شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
- تیراژ: ٥٠٠ دانە.
- چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر ٢٠٠٩

# ناوەرۆك



## القسم العربي:

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ( ئەکادیمی ) کوردی دا

گۆڤاری ئەکادیمی گۆڤارێکی وەرزییە. لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی کوردستانی عێراق، بڵاو دەکاتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە، لێکۆڵینەوەکان بۆ پلەی زانستیی سوودمەند دەبن. بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەکان گرفت و ئاریشەکی دیاریکراو یان پێشبینی کراو، چارەسەر بکەن و، بیرو هزرێکی ڕەسەن یان تازە لە خۆ بگرن، یان لایەنێکی زانستی بدۆزنەوە. نابێت لێکۆڵینەوەکان لە هیچ گۆڤارێکی دیکە بڵاو کرابنەوە یان پەسەندی بڵاوکردنەوەی لەسەر درابێت.

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە شێوە و ناوەڕۆك و پێکهاتووی لێکۆڵینەوە

(١) لێکۆڵینەوەکە، بە چوار دانە، لەسەر کاغەزی سپی پێوانە (A4)، بە مەرجێك لە هەر چوار لاوە، دووری (٢,٥)سم بەجێ هێشترابێت، دەنێردرێت. ژمارەی گشت لاپەڕەکانی لێکۆڵینەوەکە، بۆ زانستە ڕووتەکان و پراکتیکییەکان لە (٢٠) لاپەڕە تێپەڕ نەکات و، لێکۆڵینەوە زانستە مرۆییەکانیش، بە وێنە و خشتەکانیانەوە، لە (٢٥) لاپەڕە پتر نەبێت.

(٢) لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچێك هەبێت، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە و ناو و شوێنی کارکردن و پلەی زانستی و کار و وەزیفەی لێکۆڵەر، لە خۆ بگرێت.

(٣) زمانی بڵاوکردنەوە، زمانی کوردییە، بەڵام لێکۆڵینەوە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاو دەکاتەوە. کورتەی لێکۆڵینەوەکەش Abstract، بە هەر سێ زمان دەبێت.

(٤) ناوەڕۆك و پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکە بەم جۆرە دەبێت:

أ) ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە، بە شێوەیەکی کورت و پوخت و گشتگیر، لە ناوەڕاستی سەرووی لاپەڕەی یەکەم، دادەندرێت.

ب) کورتەی (Abstract) لێکۆڵینەوەکە، بە دوو زمانەکەی تر دەبێت، کە لێکۆڵینەوەکەی پێ نووسراوە، بەمەرجێك لە (١٥٠) وشە تێپەڕ نەکات و ئەو ئامانج و ئەنجامە لە خۆ بگرێت، کە لێکۆڵەر پێی گەیشتووە.

(ج) پێشەکی و ناوەڕۆك و ئەنجام.

(٥) شێوازی سەرچاوەکان لە پەراوێزدا:

أ) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە کتێب وەرگیرا، ناوی نووسەر یان دانەر بەبێ پاش و پێش، ناونیشانی تەواوی کتێبەکە، ناوی

بلأوكەرەوە، چاپ (جگە لە چاپی یەکەم)، شوێن و ساڵی چاپکردن، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

ب) ئەگەر وەرگرتنی بێ دەستکاریی (الاقتباس) لە لێکۆڵینەوە وەرگیرا، ناوی لێکۆڵەر، ناونیشانی لێکۆڵەر، ناوی گۆڤار، ژمارەی گۆڤار، شوێن و ساڵی چاپ، لاپەڕە، تۆمار دەکرێت.

(٦) ئەگەر لێکۆڵینەوەکە ساغکردنەوەی دەستنووسێك لەخۆ بگرێت، پێویستە ڕێوشوێنی بنەما و پرۆگرامی زانستی لەگەڵ لێکۆڵینەوەکە، هاوپێچ بکرێت.

(٧) بەرەچاوکردنی بیرۆکەی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەکە، دەستەی نووسەران، ئەو مافەی هەیە دەستکاری هەندێ لایەنی داڕشتن بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ شێوازی بلأوکردنەوەیدا، بگونجێت.

(٨) وا باشە لێکۆڵینەوەکە لەسەر (CD) تۆمار کرابێت و چوار دانەی ڕاکێشراویش لەگەڵیدا هاوپێچ بکرێت.

(٩) لێکۆڵینەوەکە، نیشانی سێ شارەزای پسپۆری بابەتەکە دەدرێت، ئەگەر پەسەند کرا، ئەوا لەلایەن دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، ڕەزامەندی لەسەر دەدرێت.

(١٠) ئەو لێکۆڵینەوانەی گۆڤاری ئەکادیمی بلأویان دەکاتەوە، دەربڕین لە بیرو بۆچوونی نووسەر دەکەن، پێویستییەتی دەربڕینی گۆڤارەکە، ناگەیەنن.

**دەستەی نووسەران**

# تعليمات النشر
# في مجلة ( الأكاديمي ) الكوردية

المجلة مجلة فصلية. ينشر فيها النتاج العلمي من داخل وخارج اقليم كوردستان - العراق. وتكون البحوث مستوفية للتعليمات الخاصة بالنشر وتخضع للتقويم العلمي. ويتعيّن ان يتضمن البحث حلاً لمشكلة قائمة أو متوقعة، أو يتضمن فكرة أصيلة أو جديدة أو اكتشافاً علمياً، على ان لايكون منشوراً أو مقبولاً للنشر في مجلة أخرى.

# التعلميات الخاصة
# بالشكل وترتيب البحث

١ـ يرسل البحث بأربع نسخ على اوراق بيضاء من قياس (A4) مع ترك مسافة ٢,٥سم من الجهات الاربعة، على ان لايزيد عدد الصفحات الكلية للبحث عن (٢٠) صفحة لبحوث العلوم الصرفة والتطبيقية وعن (٢٥) صفحة لبحوث العلوم الانسانية بضمنها الاشكال والجداول.

٢ـ ترفق بالبحث ورقة تتضمن عنوان البحث وإسم الباحث ومركز عمله، ومرتبته العلمية ووظيفته.

٣ـ لغة النشر هي اللغة الكوردية، ولامانع لنشر بحوث باللغتين العربية او الانگليزية. وتوضع الملخصات Abstracts باللغات الثلاث.

٤ـ يرتب البحث على النحو التالي:

أـ عنوان البحث: يتوسط أعلى الورقة الاولى، ويفضل ان يكون قصيراً وشاملاً.

ب ـ يوضِّح الباحث الهدف من البحث والنتائج والتوصيات المهمة التي توصّل اليها.

ج ـ المقدمة والمتن والنتائج.

٥ـ اسلوب ترتيب المصادر في الهوامش.

أ ـ إذا كان الإقتباس من كتاب: يدوَّن اسم المؤلف. بدون قلب الاسم، عنوان الكتاب بالكامل، الناشر، الطبعة، (عدا الطبعة الاولى)، مكان وتاريخ الطبع، الصفحة.

ب ـ إذا كان الإقتباس من بحث: يدوَّن اسم الباحث، عنوان البحث، اسم المجلة الناشرة، رقم المجلة أو العدد، مكان وتاريخ النشر، الصفحة.

٦ـ حين يكون البحث تحقيقاً لمخطوطة تتّبع القواعد والمناهج العلمية المعروفة، وترفق بالبحث ست صفحات من المخطوطة.

٧ـ تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في أن تحذف أو تعيد صياغة بعض الالفاظ، بما يتلاءم مع اسلوبها في النشر، مع مراعاة المحافظة على الفكرة الأصلية دون المساس بها.

٨ـ يستحسن ارسال البحث على CD وارساله برفقة النسخ المذكورة.

٩ـ يعد البحث مقبولاً للنشر، ويزوِّد الباحث بقرار هيئة التحرير بقبوله بعد عرضه على ثلاثة محكّمين (خبراء) من ذوي الاختصاص.

١٠ـ ماينشر في المجلة يعّبر عن وجهة نظر الباحث، وليس بالضرورة تعبيراً عن وجهة نظر المجلة.

**هيئة التحرير**

IRAQI KURDISTAN REGION
MINISTERY OF HIGHER EDUCATION
& SCIENTIFIC RESEARCH
UNIVERSITY OF SALAHADDIN - Erbil
Vice President Office
For Scientific Affair



هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر
ئۆفیسی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی

ژمارە: ٣/ ٨٩٢٩
مێژووی زاینی ٢ / ٥ / ٢٠٠٨
مێژووی کوردی ١٠ / ٢ / ٢٧٠٨

**بۆ/ ئەکادیمیای کوردی/ بەڕێز سەرنووسەری گۆڤاری ئەکادیمی کوردی**

**ب/ ڕەزامەندی**

**سلاو و ڕێز..........**

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە /٣٥٤ لە ٢٠٠٧/١١/١٩ .

دەربارەی ڕەزامەندی ئەنجومەنی زانکۆکەمان لەسەر ئەوەی کە گۆڤارەکەتان ببێتە گۆڤارێکی ئەکادیمی/ زانستی و پشتی پێ ببەسترێت بۆ بلاوکردنەوەو بەرزکردنەوەی پلەی زانستی ، دوای ئەوەی کە خرایە بەردەم ئەنجوومەنی زانکۆ لە دانیشتنی کۆنووسی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانکۆمان ژمارە (٨) ڕۆژی سێشەممە لە ڕێکەوتی ١/ ٤/ ٢٠٠٨ بەسترابوو. وە ئاماژە بە نووسراوی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی ژمارە ن / ٢٣٥ لە ٢٠٠٨/٥/١٧ بە پەسند کردنی بڕیارمان دا بەرازی بوون و پەسندکردنی وەکو گۆڤارێکی زانستی / ئەکادیمی لەگەڵ ڕەچاوکردنی چەند تێبینی یەکی بچووک .......... لەگەڵ ڕێزدا

**هاو پێچ//**

- تێبینیەکان

**د. محمد صدیق محمد**
**سەرۆکی زانکۆ**

**وێنەیەک بۆ//**

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ / لەگەڵ ڕێزدا
- نووسینگەی بەڕێز یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستی/ لەگەڵ بەراییەکان
- لیژنەی ناوەندی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە سەرۆکایەتی زانکۆ
- دەرکردە

| | | |
|---|---|---|
| *Kurdistan Regional Government*<br>*Presidency of Ministers Council*<br>*Ministry of Higher Education and Scientific Research*<br>*Presidency of University of Koya*<br>*Office of President* |  | حکومەتی هەرێمی کوردستان<br>سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران<br>وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی<br>سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە<br>نووسینگەی سەرۆك |

ژمارە: ٧ / ٢٩ / ٢٧٨٩ بەروار: ٢ / ٦ / ٢٠٠٨

**﴿فەرمانی زانکۆیی﴾**

**بابەت / ناساندنی گۆڤار**

ئاماژە بە خاڵی (١) تەوەرەی سێ یەم کاروباری زانستی لە کۆنووسی چواردەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی زانکۆ لە ٢٠٠٨/٥/٢١ وە دوای هەڵسەنگاندنی گۆڤاری ئەکادیمی کوردی بڕیار درا بە :-

ناساندنی ئەم گۆڤارە وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان و وەك گۆڤارێکی ئەکادیمی مامەڵەی لەگەڵ بکرێت .

**پ. د. خدر مەعصوم**

**سەرۆکی زانکۆ**

وێنەیەك بۆ:

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ
- بەڕێزان یاریدەدەرانی سەرۆکی زانکۆ
- راگرایەتی گشت کۆلیجەکان
- دۆسیەی دەرچوو

www.koyauniversity.org dnya

# دامەزراندنی میرنشینی بادینان
# توێژینەوەیەکی مێژوویی شرۆڤەکاری

**د. قادر محەمەد پشدەری**

زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر/کۆلێژی ئاداب/بەشی مێژوو

**سەرەتا:**

**میرنشینی بادینان یان میرنشینی ئامێدی، لەمێژووی کورد دا، جێگایەکی تایبەتی هەیە و یەك لەو دەسەلاّتدارییە سیاسییە کوردییانەیە، کە هەم لە پانتاییەکی تاڕادەیەك بەرفراوانی جوگرافی و هەم لەماوەییکی مێژوویی درێژدا فەرمانڕەویی کردووە. لەناو قەڵەمڕەوی میرنشینەکەدا، تەنایی و ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی ڕەنگی داوەتەوە، وێڕای دەسەلاّتێکی سیاسی سەقامگیر و مکوم پێشقەچوونی شارستانییانەی بەرچاویشی هەبووە و زانای بەناوبانگی لێ هەڵکەوتوون و ڕۆڵی کارای خۆیان لە زانستە جۆربەجۆرەکان وازی کردووە.**

**شاری ئامێدی ـ کە پایتەختی میرنشینەکە بووە - هەر بەسروشتی جوان و دلگیر و هەڵکەوتووی جوگرافیای تاقانەی بەناوبانگ و ناودێر نییە، بەڵکو یەك لەشارە مێژووییەکانی کوردستانەو هەم وەکو قەلاّیەکی سەخت و هەم وەکو ئاوەدانییەکی دێرین لە کۆنەوە ناسراوە. سەختی شوێنەکەیی و ئاکنجی بوونی هەندێك لە هۆزە بەناوبانگەکانی بادینان لەوێ، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەوێی کردبووە پێگەیەکی دیاری کوردەکانی ناوچەکە و جێگای بەرخودانی بەردەوامیان لەدژی ستەمی هێزە داگیرکەر و خۆسەپێنەکانی دەڤەرەکە.**

هەموو ئەو بایەخ و ناوبانگەی میرنشینەکە هەیبووە، وا دەکات، پرسە جیاجیاکانی مێژووی میرنشینی بادینان، جێی خستنەڕوو هەڵوەستە لەسەرکردن و تاوتوێکردن بن. ئەویش، لەپێناوی ساغکردنەوە وپەیبردن بەلایەنە شاراوەکانی و قووڵبوونەوەیەکی زیاتر بەمێژووی ناوچەکەدا. یەك لەو پرسانەی کە لە مێژووی میرنشینی بادیناندا، وەکو پێویست توێژینەوەی لەسەر نەکراوەو لەژێر تیشکی ئەو زانیارییە کەمانەی کە لەو بوارەدا هەن، لێکدانەوەی مێژووییانەی بۆ نەکراوە، مەسەلەی دامەزراندنی میرنشینی بادینانە، کە هەتا ئێستا ڕوون نییە کەنگێ میرنشینەکە دامەزراوە؟ لەلایەن کێ وە یەکەمین بەردی بناغەی ئەو دەسەڵاتداریەتییە کوردییەکەی ڕۆنراوە؟.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات ئەو زانیارییە مێژووییە پچڕ پچڕ و بەر بڵاوانەی لەو بارەیەوە هەن ، پۆلێن و شیرازەدار بکاو لە سەرچاوە جیاجیاکانەوە بیانگوازێتەوە، ئینجا بە لۆژیکێکی مێژووییانەی پشت ئەستوور بە ئاگادار بوون لە گۆڕانکارییەکانی سەردەمەکە، تاوتوێ و گەنگەشەیان بکات.

توێژینەوەکە جگە لە سەرەتا و بەرەنجامەکان، لە سێ تەوەری سەرەکی پێکدێت:

**تەوەری یەکەم:** تەرخانە بۆ باسکردنی بیروبۆچوونە جیاوازەکان لە بارەی دامەزراندنی میرنشینەکەو دامەزرێنەرەکەی.

**تەوەری دووەم:** تایبەتە بەخستنە ڕووی هەندێك لەو زانیارییە مێژووییانەی کە لە سەرچاوە رەسەنەکان وەرگیراون و تاڕادەیەك دیرۆکی ئامێدی لەسەردەمی ئیسلامی ڕوون دەکەنەوەو خزمەتی باسەکە دەکەن.

**تەوەری سێیەم:** تێڕوانینێکی شرۆڤەکارانەیە بۆ دامەزراندنی میرنشینەکە و دامەزرێنەرەکەی و یەکالاکردنەوەی زانیارییە جیاوازەکان لەو بوارەدا.

## تەوەری یەکەم

## ڕا و بۆچوونە جیاوازەکان

سەرەتای دەست پێکردنی دەسەلاتی سیاسی میرنشینی بادینان، - وەکو زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی دیکە - چونکە لە سەرچاوە ڕەسەنەکاندا یەکلا نەکراوەتەوە،. بۆچوون و لێکدانەوەی جۆراو جۆری بۆ کراوە و مێژوونووسان و توێژەران بە پێی تێڕوانین و خوێندنەوەی خۆیان بۆ زانیاریە مێژووییەکانی نێو سەرچاوەکان و ڕووداوەکانی ناوچەی ئامێدی، ساڵ و سەدە و سەردەمی دامەزراندنی میرنشینەکەیان دیاری کردووە. ئەمەش ئێمەی لە بەرامبەر کۆمەڵێك ڕا و بۆچوونی جودا و نالێك و تێکچڕژاو داناوە. بۆیە بەپێویستی دەزانین پۆلێنی گرنگترین ئەو بۆچوونانە بکەین و بەم شێوەیە بیانخەینە ڕوو:

١- بۆچوونی مێژوونوسان و توێژەرانی کورد:

کۆنترین سەرچاوەی زانراوی نووسراو کە مێژوونووسێکی کورد نووسیبێتی و باسی میرنشینی بادینانی تێدا بێ کتێبی (شەرەفنامەیە)، کە تێیدا هاتووە: بنەماڵەی دەسەلاتداری بادینان لە بنەچەکەی بهاءالدین ناوێکە، کە کاتی خۆی لە شەمدینان (چولە میرگ)ەوە ماڵی هێناوەتە ئامێدی و ئەو بنەماڵەیەی لەوێ کەوتۆتەوە، بە بادینان ناوی ڕۆیشتووە و نزیکەی چوار سەد ساڵە لە ئامێدی فەرمانڕەوایی دەکەن(١). واتا لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سێزدەیەمی زایینی. مێژوونووس محمد ئەمین زەکی بەگ، بەشێك لەزانیارییەکانی ناو شەرەفنامەی نووسیوەتەوە پێدەچی ئەویش هەمان ڕای شەرەفخانی هەبووبێ و زانیارییەکی تایبەتی لەسەر دامەزراندنی میرنشینەکە نەخستۆتە ڕوو(٢).

کتێبــی شــەجەرا زیۆکیــا (الــشجرة الزیوکیــة)، کــە هــەتا ئێــستا دەستنووسە و مێژووی دانان و نووسەرەکەی نادیارن و زانیاری هەیە، کە لــە کۆتاییــەکانی ســەدەی هەژدەهــەمی زایینــی ســاڵی ١٧٩٥ ســەرلەنوێ نووسراوەتەوە، بە یەك لە سەرچاوە گرنگەکانی مێژووی بادینان دەزانـرێ لەو کتێبـەدا وا یاداشت کـراوە: کـە پـاش کـوژرانی خەلیفـە (المستعصم)ی عەباسی لەلایەن هۆلاکۆوە ساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز)، یەك لە کوڕەکانی خەلیفە بەناوی محمد قوتاری دەبێ و پاش ماوەیەك، نەوەیەکی بـەناوی عزالـدین، دەست بەسەر هەندێك لە قـەڵاکانی ناوچـەی هـەکاری دا دەگـرێ، ئـەویش کوڕێکی هەیە بەناوی خلیل کـە بـەهاوکاری عەشیرەتەکانی ئـەو دەڤـەرە، دەســت بەســەر ناوچــەی ئامێـدی دا دەگــرێ و لــەبن دەســتی پاشـایەکەی بەناوی (تازی) دەری دێنێ. دوای خلیل کوڕەکەی بەناوی بهاءالدین حـوکم دەکـات و دامەزرانــدنی میرنــشینەکە بــۆ دەوروبــەری ســاڵی ٧٤٠ك/١٣٣٩ز دەگێڕێتەوە(٣).

مێژونووس ئەنوەر مائی، هەرچەندە دەستنووسی شـەجەرا زیۆکیـا بـە سەرچاوەیەکی بەهادار دەزانێ و گێڕانەوەیەك لەدەستنووسەکە وەردەگرێ کە جیاوازە لەوەی پێشتر ئاماژەمان پێدا و بنەچەی بنەماڵەی دەسەلاتدار دەباتەوە سەر شێخ شمس الدین کوڕی شجاع الـدین کـوڕی مـیر نجـم الـدین خــضر کــوڕی مبارزالــدین کــك، و ڕەخنــە لــە وابەســتەکردنیان بــە عەباسییەکان دەگرێ، پێی وایە ئەم مەسەلەیە بنەمایەکی مێژوویی نییە. هەروەها میر بهاءالـدین کـوڕی شمـس الـدین بەدامەزرێنـەری میرنـشینەکە دەزانێ و وای دانـاوە کـە لـە دەوروبـەری سـاڵی ٦٥٩ك/١٢٦٢ز فـەرمانڕەوایی دەستی پێ کردووە(٤).

به ئاماژەدان بەم ڕا جیاوازانە، هەندێك وای بۆ دەچن، كە میرنـشینەكە لە سەدەی سێزدەهەمی زاینی دامەزراوە(٥).

بـەم شـێوەیە تێبینـی دەكـرێ مێژوونووسـان و توێـژەرانی كـورد زیـاتر لەگـەڵ دێرینیـی میرنـشینەكەن و كـۆكن لەسـەر ئـەوەی مـیر بهاءالـدین دامەزرێنـەری میرنـشینەكەیە و ناچـنە ژێـر بـاری ئـەوەی، كـە بنەماڵـەی دامەزرێنـەر پەیوەندییـەكی ڕاسـتەوخۆی بـە ماڵبـاتی عەباسـییەكانەوە هەبێ.

٢- بۆچوونی مێژوونووسان و توێژەرانی عەرەبی عێراقی:

هەندێك لە مێژوونووسانی عـەرەبی عیراقـی، هـەم لـەدووتوێی كتێبـە مێژوییـە گـشتییەكان و هەروەترلـە كتێـب و دانـراوی تایبـەت بـە میرنـــشینەكەو ناوچـەی ئامێدیـدا، گرنگییـەكی دیاریـان بەمێـژووی میرنشینی بادینان داوە.

مێــژوونووس یاســین العمــري (١٨١٦ز) دامەزرانــدنی میرنــشینەكە دەگێڕێتـەوە بـۆ سـەرەتای سـەدەی نۆیـەمی كۆچـی/ پازدەیـەمی زاینـی(٦) ئەمەش ئەو سـەردەمەیە كـە میرنـشینەكە ناوبـانگی هـەبوو دەسـەڵاتی لـە ناوچەكە چەسپابوو.

لـەو بۆچـوون و بـاس و خواسـانەی مێـژوونووس (صـدیق الـدملوجی) خستوونییە ڕوو، تێدەگەین، وای دادەنێت كە میرنشینەكە كۆتایی سـەدەی حەوتەم و سەرەتاكانی سەدەی هەشتەمی كۆچی دامەزراوە(٧).

ساڵی ٧٤٠ك/١٣٣٩ز و كەمێك دوای ئەو مێژووە لەلای بەشێك لـە مێـژوو نووسانی عەرەبی عیراقی بە ساڵ و سـەردەمی دامەزرانـدنی میرنـشینەكە دەزانرێ(٨)، بەو پێیە بۆ زانینی دیرۆكی دامەزراندنی میرنشینەكە، ناشێ بگەڕێینەوە بۆ پێش ساڵی ٧٤٠ك / ١٣٣٩ز.

ئەوەی لە بۆچوونی بەشێك لەمێژوونووسانی عەرەبی تێبینی دەکرێت، بەستنەوەی دامەزرێنەری میرنشینەکەیە بە بنەماڵەی عەباسییەکان و دیاری نەکردنی مێژوویەکی ڕوونە بۆ دامەزراندنی میرنشینەکە، هەرچی لەو بوارەدا خراوەتە ڕوو، کۆمەڵێك گریمانەیە کە مەرج نییە پشت ئەستووربن بەزانیاری نێو سەرچاوە کۆنەکان.

**٣- بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان:**

گەشتیار و ڕۆژهەڵاتناسانی رۆژئاوا، کە باسی عێراق و کوردستانیان کردووە، لە سەر مێژووی ئەم ناوچەیەیان نووسیوە و تێبینییان لەو بارەیەوە داوە، هەندێکیان لایان لە میرنشینی بادینان کردۆتەوە و لەمەڕ سەرەتای دەست پێکردنی دەسەلاتی سیاسی و سەردەمی کۆن و پێگەی کۆمەلایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری، زانیارییان نوسیووە.

گەڕیدەی ئینگلیزی ك. ج. ڕیچ کە لەساڵی ١٨٢٠ز بە کوردستاندا گەڕاوە، نووسیویەتی میرنشینەکە لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە دامەزراوە (٩)، ئەمەش دەری دەخات کە ئەو ڕۆژهەڵاتناسە تەنها مێژووی نزیکی میرنشینەکەی خوێندۆتەوە، زانیاری لەمەڕ ڕیشە مێژووییەکانی دەسەلاتی سیاسی و بنەماڵەی دەسەلاتدار نەبووە.

هەروەها لۆنگریك سەرەتای دامەزراندنی میرنشینەکەی گەڕاندۆتەوە بۆ کۆتایی سەدەی هەشتەمی کۆچی/چواردەمی زایینی (١٠) بەلام ڕۆژهەلاتناس مینۆرسکی پێی وایە میژووی دامەزراندنی کۆنترە و هەر پاش نەمانی حوکمی زەنکییەکان دست پێدەکاو سەرەنجام دەیگێڕێتەوە بۆ سەدەی (٧و٨ك) (١٣و١٤ز) (١١) بەم شێوەیە، تاڕادەیەك، ئەو کەونارایەی کە لەمێژووی دامەزراندنی میرنشینی بادینان هەیە، ڕوون دەکاتەوە، وای

نیشاندەدا کە دەسەلاتی خۆجێی کوردی دوای نەمانی زەنکییەکان لە ناوچەی بادینان دەرکەوتووە.

بەلام رۆژهەلاتناس د. ن. ماکێنزی مێژووی دامەزراندنەکەی زیاتر دیار دەخاو پێی وایە، کە میرنشینی بادینان دەوروبەری سالی ٦٠٠ك/١٢٠٣ز دامەزراوە(١٢)

لەمەش دا، وادیارە، کە ماکێنزی کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو دیاریکردنەی کە شەرەفخانی بدلیسی کردوویەتی.

بەلام لەبارەی دامەزرێنەری میرنشینەکە، ئەوا هەندێ لە رۆژهەلاتناسان، میر بهاءالدین بەدامەزرێنەی دادەنێن کە سێ کوڕی هەبووە، دوای خۆی میر زین الدین فەرمانڕەوای گێڕاوە دوای ئەویش میر سیف الدین(١٣) ئەمەش لەگەڵ زانیارییەکانی هەندێك لە سەرچاوە کۆنەکاندا دێتەوە.

## تەوەری دووەم
## خستنەڕوی زانیاری مێژوویی

لەوەی کە پێشتر خرایە روو، تێدەگەین، کە نە مێژوونووسانی کۆن و نە مێژوونووسانی هاوچەرخ، نەیانتوانیوە مێژووییەکی روون بۆ دامەزراندنی میرنشینی بادینان بخەنە روو، هۆیەکەش روونە کە بۆ ساغکردنەوەی ئەو مەسەلەیە تائێستا کەمتر پشت بە سەرچاوە کۆنەکان بەستراوە و دیرۆکی ئامێدی لەو سەردەمە مێژووییەی کە گومان دەکرێ میرنشینەکەی تێدا دامەزرابێ، شەنوکەو نەکراوە ، بۆیە میتۆدی ئێمە کارکردنە لەسەر چەند راستییەکی دێرۆکی کە پەیوەندی بە مێژووی

ناوچەی ئامێدی هەیە، بە پشت بەستن بە سەرچاوە هاوچەرخەکانی سەردەمەکە، دەشێ وێناکردنی راست لەسەر سەرەتاکانی دەرکەوتنی میرنشینی بادینان بەدەستەوە بدەین بەم شێوەیە:

١- ناوی ئامێدی لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمی کۆچی/ دوازدەیەمی زاینی دێتە ناو ناوان و پێشتر لە جێگای وێ، ناوچەکە، قەلایەکی لێ بووە بەناوی (ئاشب) کە مەلبەندی کوردە هەکارییەکان بووە و لەساڵی ٥٣٧ ك/١١٤٢ز دەکەوێتە بن دەستی عمادالدین زەنگی ئەتابەکی موصل (٥٢١ - ٥٤١ك/١١٢٧ - ١١٤٧ز) هێزەکانی زەنکی قەلای ئاشب دەروخێنن(١٤) و لە نزیك وێ قەلایەکی دیکە ئاوا دەکەنەوە کە بە ( عمادیە ) دەناسرێ(١٥).

بەلام دەڤەرەکە هەر لە سەردەمی دەرکەوتنی میرنشینە کوردییەکانی سەردەمی عەباسی، وەکو ناوچەی کوردە هەکارییەکان ناوی دێت، دیارە جۆرێك لە دەسەلاتی سیاسی و سەربازییان لە ناوچەکە هەبووە، چونکە پێش هێرشی زەنکییەکان، دەڤەرەکە بەدەست کوردە هەکارییەکانەوە بووە(١٦). بەلام روونە ،بەمەزەندە لە کۆتایەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەی زاینی، ناوچەی ئامێدی و چەندان قەلای دەڤەری هەکاری، لەلایەن بنەماڵەی أبو الهیجاءی هەکارییەوە میرایەتی بەسەرەوە دەکرا، بەلگەش ئەو زانیارییەی مێژوونووس ابن خەلەکانە کە باسی (کمال الدین ابن مشطوب ) دەکا – کە یەك لە سەرکردەکانی سەلاحەدینی ئەییوبی بووە، نووسیویە: کەوا باپیری أبوالهیجاء خاوەنی ئامێدی و چەندان قەلای دیکە بووە( ١٧ )

ئەوەمان بۆ ئەوە هێنایەوە بیسەلمێنین، کە ریشەی دەسەلاتی سیاسی کوردی لە ئامێدی کۆنەو هەروەها پێش دامەزراندنی میرنشینی بادینان میرنشینی کوردەکانی هەکاری لەوێ هەبووە.

٢- لەساڵی ٥٣٧ ك/١١٤٢ز میرنشینی هەكاری لەلایەن زەنكییەكانەوە دەرووخێ، هەر لەوێ ساڵی ڕا هەتاوەكو ساڵی ٦١٨ك/١٢٢١ز ناوچەی ئامێدی، لە ژێر دەستی دەسەڵاتی زەنكییەكان و میراتگرانیان دەمێنێتەوە، لەو ماوەیەدا هیچ زانیاریەك لە بارەی بوونی دەستەڵاتداریەكی كوردی لە ناوچەكەدا نییە، هەتا لە ساڵی ٦١٨ك خەڵكی ئامێدی دەست و پێوەندانی دەستەلاتداریەتی بدرالدین لؤلؤ ئەتابەكی موصل وەدەردەكەن سەركردەی خەڵكەكە ئەو كات كوڕەكانی (خواجە أبراهیم) ن كە هەتا سالی ٦٢٢ ك/١٢٢٥ز حوكمی دەڤەرەكەیان دەكرد لەم ساڵەدا سوپای بدرالدین لؤلؤ ئامێدی گرت، كە هەتا هاتنی مەغۆلەكان لە بن دەسەڵاتیان دەمێنێتەوە (١٨).

هەرچەندە دیارنییە، كە ئایا خواجە ابراهیم كوردە یان نا؟ بەلاَم لە لایەن خەڵكی ئامێدی ماوەیەك پشتیوانی لێ كراوە چەند ساڵێك دەسەڵاتی درێژە پێداوە.

٣- لە سەروبەندی هاتنی مەغۆلەكان ناوچەی ئامێدی شەڕو وێرانكاری بە خۆ نەدیت ، چونكە بدرالدین لؤلؤ لە رێگای دەست و پێوەندەكانیەوە لە موسڵەوە حوكمی وێی دەكردو بۆ خۆی ملكەچی مەغۆلەكان بوو بوو ، بۆیە تا مردنی لەساڵی ٦٥٧ك/١٢٥٩ز دەڤەرەكە لە ئەغزی مەغۆلەكان پارێزراوە، دواتر لەساڵی ٦٦٠ك/١٢٦١ز شاری موسڵ لەلایەن مەغۆلەكانەوە گیرا دەسەڵاتداری ئامێدی (عزالدین أیبك) كە پێشتر سەر بە بەدرەدین بوو توانی مەغۆلەكان لەخۆی ڕازی بكات و هەر بەدەسەڵاتداری وێندەرێ بمێنێتەوە هەتا ساڵی ٦٦٧ك/١٢٦٨ز (١٩) لە دوای ئەم ساڵە نێوی دوو میری كوردی هەكاری دێن كە میرایەتییان بەسەر ئامێدیەوە كردووە بە

ناوەکانی میر أبوبەکر و میر علی کە برا بوون و دژایەتی دەسەلاتی مەغۆلەکانیان کردووە پاش ئەوەی میر أبوبەکر دەکوژرێ میر محمد ی کوڕی جێی دەگرێتەوە وە میر علی برای درێژەی بەفەرمانڕەوایی داوە هەتا مردنی دوای ئەویش کوڕەکەی بەناوی عزالدین جێگای دەگرێتەوەو قەلاَی هرور لە ناوچەکەدا دەکا بە بنکەی خۆی(٢٠) .

ئەمەش ئاماژەیەکی دیکەیە بە حوکمداری کوردە هەکارییەکان لەئامێدی و دواتر هەڵکشانی مەڵبەندی دەسەلاتداریەتییان بۆ ناوچەکانی سەرەوە، بۆیە دەشێ بڵێین لە کۆتاییەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سێزدەی زایینی دەڤەری ئامێدی لەلایەن کوردەکانی هەکارییەوە حوکم دەکرا، بەلاَم پێ دەچووو خودی شاری ئامێدی دوای ئەو سەردەمە کەوتبێتە بن دەسەلاتی مەغۆلەکان چونکە هەم چارەنووسی محمد و عزالدین و بنەماڵەکەشی و شاری ئامێدی لەو وەختەدا ڕوون و دیار نییە. و پی دەچێ ئەو بنەماڵەیە دواتر تێهەڵچوبنەوەو لە ناوچەکە درێژەیان بە فەرمانڕەوایی دابێ.

٤- هەتا ساڵی ٧٣٩ك / ١٣٣٨ز لەنێو سەرچاوە مێژووییەکاندا، نێوی کەسایەتی دەسەلاتداری کوردی لە ناوچەکانی ئامێدی نایەت، و لە سەرچاوە مەملوکیەکاندا، جار بە جار، ئاماژە بە خاوەن یان دەسەلاتداری عمادیە (صاحب العمادية) کراوە(٢١)، یەك لە وانە میر(حاجی بن عمر)ە کە ماوەیەك فەرمانڕەوایی کردووە (٢٢)، کە نازاندرێت ئایا لە بنەماڵەی خانەدانی دەسەلاتداری دەڤەرە کەبووە یان نا؟ وە چەند ساڵ میرایەتی کردووەو دوای خۆی ئایا میرایەتی لە ناوچەکە هەر لەبنەماڵەی وان درێژەی هەبووە یان نا؟

مێژوونووس (ابن فضل الله العمری) (م ٧٤٩ك/١٣٤٨ز) یاداشتی کردووە کە لە ناوچەی چۆلە مێرگ _ کە لە بەشی سەرووی دەڤەری هەکارییە وە نزیکە لە گۆلی وان - جگە لە بنەماڵەی مەنکەلانی هەکاری بنەماڵەیەکی دیکەی دەسەڵاتدار هەبوون حوکمدارییان کردووە، لەو سەردەمەدا گەورە و بەدەسەلاتیان بەناوی بهاءالدین کوڕی قطب الدین بووە کە لەگەڵ ئامۆزایەکەی شمس الدین کوڕی داود دژایەتی مەغۆلەکانیان کردووە و ناچاریان کردوون کە سازشیان لەگەڵ بکەن، مەغۆلەکان رێگایان بە میر بهاءالدین و ئامۆزاکەی و دەستوپێوەندیان داوە کە دەستبەردار ناوچە قایم و سەختەکانیان ببن و لە شارو ئاوەدانی دیکە نیشتەجێبن(٢٣)، کەوا پێدەچێ میر بهاءالدین لە شاری ئامێدی گیرسابێتەوە و میرنشینەکەی دامەزراندبێ ئەمەش تارادەیەك لەگەل زانیاریەکانی نێو شەرەفنامە دێتەوە کە باس کراوە میر بهاءالدین لە ناوچەی شەمدینانەوە هاتووە، باپیرانی لەوێ حوکمیان کردووە (٢٤) کە دەکاتە ناوچەی چۆڵە مێرگ .

٥- بەپێی ئەو زانیارانەی مێژوونووس (ابن ناظر الجیش) (م٧٨٦ك/١٣٨٤ز) یاداشتی کردووە، وا تێدەگەین لە سالآنی حەفتایەکانی سەدەی هەشتی کۆچی/چواردەیەمی زاینی دەسەڵاتداری ئامێدی (عمادالدین اسماعیل کوڕی علی کوڕی موسی بووە) کە کوڕێکی*** بەناوی (بهاءالدین حسن) وێڕای باوکی میرایەتی بەسەر قەڵای هەروری نزیك ئامێدی کردووە(٢٥)، دیارە ئەو دوو میرە هاوچەرخی مێژوونووس (ابن ناظر الجیش) بوون، بەم شێوەیە روونە، کە ماوەی دەسەلاتداریەتی لە پێش ئەم مێژووەوە دەستی پێکردووە بەلآم ناتواندرێ بەوردو ڕوونی

دیاری بکرێت بۆیە سەرەتاکانی نیوەی دووەمی سەدەی هەشتی کۆچی بە پەسەند دادەنێین بەتایبەتی چونکە پێش ئەو ماوەیە لە میرایەتی ئامێدی ناوی میری دیکە هاتووە هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد .

## تەوەری سێیەم

## سەرنجێکی شرۆڤەکارانە

لە بەرەنجامی هەموو ئەو زانیاریە دیرۆکیانەی کە پێشتر خستمانە ڕوو، دەردەکەوێ، کەوا مەسەلەی دیاریکردنی ڕیشەی مێژوویی دامەزراندنی میرنشینی ئامێدی چەند سەخت و دژوارە و بۆچوون و لێکدانەوەکانی مێژوونووسان و توێژەرانی نوێ، بەبەراورد لەگەڵ زانیاری نێو سەرچاوە دێرینەکان، چەند جیاوازی هەیە، جا بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەکە، وەکو هەوڵدانێکی خاکەراییانە، بە پشت بەستن بەو زانیاریانەی پێشتر خستماننە ڕوو تاوتوێکردن و شرۆڤەکردنی خۆمان بەم شێوەیە نیشان دەدەین:

١- دەڤەری ئامێدی کە بەقەلا سەختەکەی بەناوبانگ بووە، یەك لە بنکە سەرەکییەکانی کوردە هەکارییەکان بووە، هەر لەکۆنەوە، دەسەڵاتی سیاسی کوردی، بەشێوەیەك لە شێوەکان، تێدا چەسپاو. هەرچەندە بەگریمانە، کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچیمان بۆ دەستپێکی ئەو دەسەڵاتە دیاری کردووە، بەڵام مێژووی پێشتریش بەدەر نەبووە لە چالاکی سیاسی سەربازی کوردان لەوێ، بۆیە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە دەسەڵاتی میرنشینایەتی میرنشینی ئامێدی یەکەمین دەسەڵاتی سیاسی کوردی نەبووە کە لەدەڤەرەکە دەرکەوتووە، بەڵکو پێشتر دەسەڵاتی کوردی لێ بووە.

٢- ئـەو مێـژووەی کـە شـەرەفخانی بەدلیـسی بـۆ سـەرەتای دەسـتپێکی میرنشینی بادینان دیاری کـردووە کـە بەچوار سـەد سـاڵ پـێش سـەردەمی خۆی داناوە و دەکاتە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی/ دوازدەی زاینـی، لەلایەنی مێژوویيەوە، دیـاریکردنێکی تـەواو نییـە، چـونکە، ئاشـکرایە کـە ئـەو سـەردەمە میراتگرانـی دەسـەڵاتی زەنگـی و دواتـر بـەدرەدین لۆلـۆ لـە موسڵ ڕا دەسەڵاتیان بەسەر ئامێدیدا کشاوە و هیچ ئاماژەیەك بۆ بوونی دەسـەڵاتداری کـوردی لـە دەڤەرەکـەدا نییـە،. هـەروەها دیـاریکردنی ئـەو مێـــژووە، لەگـــەڵ بەســـتنەوەی رەچـــەڵەکی میرانـــی ئامێـــدی، بەعەباسییەکانەوە، ڕێك ناکەوێ، چونکە لـە سـەرەتای سـەدەی حەوتـەمی کۆچـی، دەوڵـەتی عەباسـی، لـە باڵادەسـتی و هێـز و توانـا نەکـەوتبوو، چ دەوڵـەت و دەسـەڵاتدارییەتی دیکـەیان دانەمەزرانـدبوو، واتـا نـەڕووخابوو هەتا لە بەرەبابی عەباسییان کەسی دیکە دەسەڵاتیان ببووژێنیـتەوە. وای دەرك پـێ دەکـەین، شـەرەفخان هـەر بـۆ سـەلماندنی دێرینـی دەسـەڵاتی بنەماڵەی فەرمانڕەوای بادینان، هەر بەمەزەندە وای داناوە کە چوار سـەد سـاڵ کـەمتر نییـە کـە میرەکـانی لـە دەڤەرەکـە حـوکم دەکـەن و گـەر بیویستبایە بەوردی دیاری بکا، ئـەوا سـاڵی دامەزرانـدنی دەنووسـی، بـەڵام ئەویش، هەم دڵنیا نەبووە و هەم دیارە لە سەرچاوەکان خوێندوويەتیـەوە کـە فـەرمانڕەوایی کـوردان لـەو ناوچـەیە کۆنـە، کەواتـە لەلایـەنی مێژوویيەوە، ئەو دیاریکردنە، ناتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ.

٣- سـاڵی ٦٥٩ك/١٢٦٥ز کـە مێـژوونووس ئـەنوەر مـایی بەسـەرەتای دەسەڵاتداری میر بهاءالدین داناوە، خودی میر بهاءالـدین بـە کـوڕی شمـس الدین کوڕی شجاع الـدین کـوڕی نجـم الـدین خـضر کـوڕی مبارزالـدین کـك دیـاری کـردووە، لـە ڕوانگـەی سەرچـاوەکانی هاوچـەرخی سـەردەمەکەوە

دەستنیشان کردنێکی ورد نییە، چونکە لەو ماوەیە، ئامێدی هەر لەبن دەستی (عزالدین ایبك)دا بووە تا ساڵی ٦٦٧ك وە بەستنەوەی ڕەچەڵەکی میر بهاءالدین بە میر مبارزالدین کك دیسان دارای بنەمایەکی مێژووی پتەو نییە، میر مبارزالدین ابو بکر کك لە ناوچەکانی ئاکرێ و شۆش میرایەتی کردووە تا دوای ڕووخانی بەغداش بە دەستی مەغۆلەکان ٦٥٦ك/١٢٥٨ز ماوەیەکی زۆر هەر دەسەلاّتدار بووە و سەر بە مەغۆلەکان بووە(٢٦) دوای خۆی عزالدینی کوڕی فەرمانڕەوانی کردووە دوای ئەویش نجم الدین خضری برای بووە بە میر ئینجا شجاع الدینی کوڕی کە هەموویان لە سەردەمی دەسەلاّتداریەتی مەغۆلەکان فەرمانڕەوا بوون (٢٧) بەم شێوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا بنەماڵەی میر مبارزالدین لە ئامێدی میرایەتییان نەکردووە و لە ساڵی ٦٥٧ك/١٢٦٣ز خودی میر مبارزالدین لە ژیاندا بووەو دەسەلاّتداری ئاکرێ و شۆش بووە نەك کوڕی نەوەکەی. بۆیە هەم دیاریکردنی ئەم مێژووە و هەم بنەچەو کەسایەتی دامەزرێنەرەکەی لەگەڵ زانیاری سەرچاوە ڕەسەنەکان تێك ناکاتەوە .

٤- ئەوەی لە (الشجرة الزيوكيە) باسکراوە کەوا پاش کوژرانی خەلیفە المستعصم کوڕێکی بەناوی محمد قوتاری دەبێ و ڕادەکا و دوایی نەوەیەکی بەناوی عزالدین دەست بەسەر چەند قەلاّیەکی هەکاریدا دەگرێت و دوای خۆی مەلیك خلیل کوڕی بەیارمەتی یەك لە عەشیرەتەکانی ناوچەکە دەست بەسەر ئامێدی دا دەگرێت و لەبن دەستی (مەلیك تازی) دەری دێنێ دوای ئەویش کوڕەکەی بەناوی بهاءالدین جێگای دەگرێتەوە(٢٨). دیسان بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە ڕەسەنەکان ئەو تێکەڵهێشکردنەی دامەزراندنی میرنشینەکە و ماڵباتی عەباسییەکان هیچ بنەمایەکی

مێژوویی بڕواپێکراوی نییه.، چونکه هەم لەسەرچاوه کۆنەکانـدا ئامـاژەی پـێ نـەکراوه و هـەم وەکـو لـە خاڵـەکانی بەشـی پێـشەوه باسمـان کـرد، بنەماڵەی دەسەلاّتداری کوردەکـانی هـەکاری خـودان ترادیـسۆنی میرایـەتی بوون له ناوچەکەدا و هیچ ئاماژەیەکمان نییه کە لەو سەردەمەدا کەسێك بەو ناوه حوکمی گێڕابێ، پێدەچێ دروستکراوی سەردەمی عوسمانییـەکان بێ و بۆ ڕەواییدان و خۆبردنه پێش پەرەی پێ درابێ، هـەتا مێـژوونووس شەرەفخانی بەدلیسی بەگومان و دڕدۆنگییەوه ئاماژەی بۆ ئـەو مەسـەلەیه کردووه(٢٩).

گـەر بـەپێی گێڕانـەوەی (الـشجرة الزيوكيـة) بـێ ئـەوا دامەزرانـدنی میرنشینەکە، دەکەوێته دەوروبەری ناوەڕاستی سـەدەی هەشـتەمی کۆچـی، و هەریەکه له عزالدين و مەلیك خليل کوڕی بەمەزەنده دەبـێ لـه نیـوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی کۆچی میرایـەتییان کردبـێ، گـەر وابـێ بـۆ لـه سەرچـاوه مەملوکییەکانـدا ناویـان نـەهاتووه؟ کـه لەسـەرەتای سـەدەی هەشتەمی کۆچی ئاماژه بە خاوەنی (عماديه) دەکەن وە لە حاڵەتێکدا کـه به چەندین بەڵگەوه لە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی هەشـتەمی کۆچـی نێـوی چەند میرێکی ناوچەی ئامێدی و هەکاری له سەرچاوه ڕەسـەنەکاندا دێـت که پێشتر ئاماژەمان بۆ کردوون وەکو (میرحاجی کوڕی عمر) هەروەها له هـیچ سەرچـاوەیەکدا نـاوی (مـەلیك تـازی) نـەهاتووه، وە ڕوونـه کـه مەغۆلـەکان دژی عەباسـییەکان بـوون و ڕێگایـان نـەداوه هـیچ دەسەلاّتداریەتێکی عەباسییەکان لەبن باڵی ئەوان سەر هەڵبدات.

٥- له پاش نەمانی (عزالدين أيبك ) ٦٦٧ك/١٢٦٨ز هەردوو برا میر ابوبکر و مـیر علـی وەکـو دوو مـیری هـەکاری لـه ناوچـەی ئامێـدی و دەوروبـەری ناویـان دێـت. کـه دوای خۆیـان کوڕەکانیـان فـەرمانڕەواییان کـردووەو

نازاندرێ کەنگێ دەسەڵاتیان کۆتایی هاتووەو هەتا سەردەمی میر حاجی کوڕی عمر دەوروبەری ساڵی ٧٤٠ك/١٣٣٩ز ناوی هیچ میرێکی دیکەی کوردی هەکاری لە ناوچەی ئامێدی لە سەرچاوەکانی بەردەستدا نەهاتووە. کە دەشێ بەهۆی باڵا دەست بوونی مەغۆلەکان لە ناوچەکەدا دەسەڵاتی کوردەکانی وێندەرێ بۆ ماوەیەك پەراوێز کرابێ، هەرچەندە لەبارەی میر حاجی کوری عمر زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەر دەستدا نییە، بەڵام رێی تێدەچێ کوڕی میر بهاءالدین عمر کوری ابراهیمی هەکاری بێ کە هەر لەو سەروبەندانەدا ناوی هاتووە و لە قەلای گورگیل (حزدقیل) لەولاتی جەزیرە میرایەتی کردووە (٣٠) دیارە نێوی حاجی لەو بنەمالەیە باو بووە هەتا دامەزرێنەری فەرمانڕەوایی گورگیل بە میر حاجی بدر ناسراوە(٣١) وەلە ناو میرە هەکارییەکانی ئەو سەردەمەدا تەنها ئەو میر بهاءالدین عومەرە بەو ناوە ناسراوە.

٦- بە درێژایی سەدەی هەشتەمی کۆچی/چواردەمینی زایینی ناوچەی هەکاری و بەشی هەرەزۆری کوردستان(٣٢) لەبن دەستی مەغۆلەکانی ئیلخانی و جەلایری و تەیموری دابووە. وە هەتا سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەیەمی زایینی ماوەیەك دواتریش لەژێر کاریگەری لەشکرکێشی تەیموریەکان و پاشان قەرە قووینلوەکان بووە هەرچەندە دەسەڵاتیان لەوێ کورتخایەن بووە(٣٣).

بۆیە هەر دەسەڵاتداریەتیەك گەر ئەوکات لە ناوچەکە هەبووبێ لەژێر سایەی مەغۆلەکان بووە سەربەخۆیی تەواوی نەبووە، هەر ئەمەش وای کردووە کە ڕیشەی مێژوویی سەرەتای سەرهەڵدانی میرنشینی بادینان ئەوکات نادیار بێ و خودی لەدوایی دانی مێژوونوسی ئیسلامی لە سەردەمی مەغۆلەکانداو نەبوونی مێژوونوسی نزیك لە کوردستان و ئاشنا

پێـی، وەكـو لـە سـەردەمی  گـۆڕین هـەبوو، وێـڕای تێكـچڕژانی ڕووداو و گۆڕانكارییـەكان، هۆكـارن بـۆ كـەمی زانیـاری مێـژوویی لـە سـەر ئـەو سەردەمە.

٧- لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی كۆچی/چواردەمی زاینـی مێژووی ئامێدی ڕوون نییە و دیار نییە كە كێ دەستەڵاتداری ئەوێ بووە، بۆ ئەو سەردەمە، چەند ناوێكی میرە كوردەكانی دەڤەرەكەمان بـە گشتی لە بەر دەستدایە كە دەیانخەینە ڕوو قسەیان لە سەر دەكەین:

- هـەردوو مـیر بهاءالـدین كـوڕی قطب الـدین و ئامۆزاكـەی شمس الـدین كوڕی داود كە لە بنەماڵە هەكارییەكانی ناوچەی جۆلەمێرگ بوون لەگەل مەغۆلەكان پێك هاتوون كە دەڤەرەكەی خۆیان جێ بهێڵن، لە ناوچەیەكی دیكە جێگیر بن كە لەوانەیە لە ئامێدی گیرسابنەوە[٣٤] ئەمـە مێژووەكـەی دە گەڕێتـەوە بـۆ نیـوەی یەكـەمی سـەدەی هەشـتی كۆچـی/چـواردەیەمی زاینی، و تاڕادەیەك لەگەڵ ئـەو زانیاریانـەی شـەرەفخانی بدلیـسی دێتـەوە كە یاداشتی كردووە. بهاءالدین و شمس الـدین و مەنتـشا سـێ بـرا بـوون و خزمایەتییان لەگەڵ میرانی هەكاری هەبووە و هەر یەكەیان لە جێگایـەك دەسەڵاتی ڕۆناوەو لەناویاندا میر بهاءالدین لە ئامێدی گیرساوەتەوە[٣٥].

- هـەروەها یـەك لـەو میرانـەی كـە لـە هـەمان سـەردەمدا واتـە دوای ناوەڕاستی سەدەی هەشتەم لە دەڤەرەكـەدا حـوكمی كـردووە نـاوی بنكـەی دەسەڵاتداریەكەی بە (الرابیە) هاتووە كە قەڵایـەكی ناوچـەی هەكارییـە و فـەرمانڕەوای بـەناوی مـیر شمـس الـدین كـوڕی بهاءالـدین بـووە (٣٦) كـە ئەویش ناوەكەی نزیكە لە بنەماڵەی دەسەڵاتدارانی ئامێـدی، پێدەچـێ لـە ماڵەمیرانی ئامێدی بێ[٣٧].

- میر عمادالدین کوڕی علی کوڕی موسی ئەوکاتە وەکو خاوەنی ئامێدی (صاحب العمادیة) ناوی هاتووە باس لەوە کراوە کە خاوەنی قەلای هەروریش کەسێکە بەناوی بهاءالدین حسن کوڕی عیماد الدین(٣٨) لە هەموو ئەو ئاماژانەی کە کردمان بەتەواوی ڕوون نابێتەوە کە ئەو میر بهاءالدین وەکو دامەزرێنەری میرنشینی بادینان ناوی ڕۆیشتووە کامەیانە؟ هەرچەندە هەر ئەو بهاءالدین ەی کە هاوچەرخی مێژوونووس العمری بووە لەگەڵ شمس الدین ی ئامۆزای لە ولأتی خۆیان واتە چۆلەمێرگ هەڵقەناون ولەئامێدی گیرساونەوە ڕێی تێدەچی لەوانی دیکە لە پێشتر بێت، چونکە وێڕای ئەوەی تاڕادەیەك لەگەڵ زانیاریەکانی شەرەفنامەی دێتەوە ماوە مێژووییکەشی گونجاوە لەگەڵ ئەودیاریکردنە و گریمانانەی کە لەلایەن هەندێ لە سەرچاوەکانەوە بووی کراوە.

لەلایەکی دیکەوە گریمانەیەکی مێژووییانەی دیکە دەکرێت بوروژێنین، ئەویش بەگەڕانەوە بۆ زانیاری مێژونووس (العمري) کە باسی بنەماڵەی هەکارییەکانی چۆلەمێرگ دەکات لە سەردەمی خۆی؛ یاداشتی کردووە کە پاش مردنی میر أسدالدین موسی کوڕەکەی بەناوی عمادالدین مجلی جێگای گرتۆتەوە کە ئەویش دوو برای هەبووە بەناوەکانی عزالدین و زین الدین وەچەند مامێکیان هەبووە بەناوی عزالدین شیر و شمس الدین شیخ أمیر و میر داود و حسام الدین کە هەریەکەیان بەسەر قەلای یان شارێکەوە بوون و گەورەو کاربەدەستیان میرعمادالدین بوو[٣٩].

لە سۆنگەی ئەم زانیارییانە وای بۆ دەچین کە ئەو میرشمس الدین و میر داودەی کە ناویان هاتووە بەوەی لە بنەماڵەی میرانی چۆلەمێرگن و

لەوانەیە بەشێوەیەك لەشێوەكان پەیوەندییان هەبێ بەو بهاءالـدین كوڕی قطب الدین و شمس الدین كوڕی داودەی كە پێشتر ئاماژەمـان بـۆ كـرد كـە گوایـە لـە ئامێـدی گیرساونەتەوەو بناغـە داڕێـژی میرنـشینەكەیان لـەوێ كردووە و لەوانەیە لە دیاریكردنی ناوەكاندا مێـژوونووس العمـري هـەموو جـــارێ ورد نـــەبووبێ یـــان لەلایـــەن نووســـەرەوانی كتێبەكەیـــەوە هەندێك لەو ناوانە بەدروستی نەنووسرابنەوە.

بـــەلاّم، ئایـــا ئـــەو مـــیر و دەســـەلاّتدارانە چ پەیوەندیـــەكیان بـــە مـــیر عمادالدین أسماعیل كوڕی علي كوڕی موسی هەیە كە لەسالاّنی حەفتاكانی سەدەی هەشـتەمی كۆچـی/ چواردەمی زاینـی مـیری ئامێـدی بـووە؟. گـەر تەماشـای ڕیزبەنـدی نـاوی بـاب و بـاپیری بكـەین، لـەنێو دەسـەلاّتدارانی ئامێدی پێش ئەو ماوەیـە، نـاوی وامـان بەرچـاو ناكـەوێ بـەلاّم دەبـێ لـەو سەردەمەدا جیاوازی لـەنێوان نـاو و نازنـاودا بكرێـت كـە پـێ دەچـی چـۆن اسماعیـــل نازناوەكـــەی عیمـــادەدین بـــووە هـــەروەتر هەریەكـــە لـــە بـــاو باپیرانیـشی نازناویـان هـەبووبێ و لـە سـەردەمەكانی پێـشوودا بـە نازنـاو ناویان هاتبی وەكو شمس الدین، بهاءالدین، قطب الدین و اسـدالدین وەهـی دیكە، چونكە بەپێی زانیاری سەرچاوەكان وای دەبینین لە سـەردەمی مـیر عمادالدین دا میرنشینی ئامێدی دامەزراو و دەسەلاّتیان جێگیر بووە.

## دەرەنجام

لە ئەنجامی خستنە ڕووی زانیارییە مێژووییەکان و لێکدانەوەو شرۆڤە کردنیـان، لـە مەدامەزرانـدنی میرنـشینی بادینـان، دەکـرێ بەچـەند بەرەنجامێك بگەین 'پوختەیان بەم شێوەیە دەخەینە ڕوو:

- لە ولأتی هەکاری بەگشتی و لە دەڤـەری ئامێـدی بەتایبـەتی، لەسـەدەی هەشـتەمی کۆچـی/ چـواردەیەمی زاینـی چـوار کەسـایەتیمان بـەناوی (بهاءالدین)ەوە هەن کە یان میرو دەسەلأتدار یان لە بنەماڵەی میران بـوون ئەوانیش :

* بهاءالدین کوڕی ابراهیمی هەکاری
* بهاءالدین کوڕی قطب الدین
* شمس الدین کوڕی بهاءالدین
* بهاوالدین حسن کوڕی عیمادالدین اسماعیل

کـە ڕوون نییـە کێهـەیان ئـەو بهـاءالـدین ەیـە کـە میرانـی بادینـانی لێ کەوتوونەوە ؟

- وای دەبیـنین کـە دەسـەلأتی بنەماڵـەی میرانـی ئامێـدی هـەر لـەو مـیر بهـاءالـدین ەوە دەسـت پـێ ناکـات کـە هەنـدێك جـار وەك دامەزرێنـەر دەناسـێنرێت، بـەڵکو پێـشتر هـەر لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی هەشـتەمی کۆچی کە لەسەرچاوە مەملوکیەکاندا ئاماژە بە پۆستی (صاحب العمادیە ) کـراوە (٤٠) جۆرێـك لـە دەسـەلأتی میرایـەتی لەناوچـەکەدا هـەبووە کـە دەتوانین بڵێین لە میرنشینی بادیناندا درێژەی هەبووە.

له كۆمەڵگايەكی خێڵەكییانەی ئـەو سەردەمەشـدا، گۆڕینی دەسـەڵات لـە عەشـیرەتێكەوە بـۆ عەشـیرەتێكی دیكـە یـان هـەتا لـە بنەماڵەیەكـەوە بـۆ بنەماڵەیەكی دیكە، كەم ڕێككەوتووە بە ئاشتیانە مەیسەر بووبێ ،بـەڵكو شەڕو هەرای لێ دەكەوتەوە و هێزی تێدا بەكاردەهات، بەدرێـژایی سـەدەی هەشتەمی كۆچی، لەئامێدی، هیچ ئاماژەیەك بۆ شەڕو كوشتاری نێوخۆیی لەسـەر دەسـەڵات ،بـەدی ناكرێـت، كەواتـە میرایـەتی لـە بنەماڵەیـەكی دیـاریكراودا درێـژەی هـەبووە و هۆكـاری بـەكاری گۆڕانكـاری سیاسـی و سەربازی ئەوحەلە زیاتر خـۆی لـە دەسـەڵاتدارانی مـەغۆل و جـەلائیری دا دەبینییەوە، كە پێدەچێ بەدەسەڵاتدارانی ئەو كاتی ئامێـدی ڕازی بـووبن، چـونكە هـیچ ئاماژەیـەك بـۆ گـۆڕینی دەسـەڵات لەلایـەن وانـەوە لـە سەرچاوەكانی بەردەستدا بەدی ناكرێت .

- كتێبـی شـەرەفنامە تاكـە سەرچـاوەی كۆنـە كـە بنەچـەی ماڵـە میرانـی ئامێدی دەباتەوە سەر بهاءالـدین و ئـەو باسـە دێنێتـە گۆڕێ كـە ئـەو دوو بـرای دیكـەی هـەبوون، هەریەكـەیان لـە ناوچـەیەك بالأدەسـت بـوون بهاءالدین لە شەمزینانەوە هاتۆتە ئامێدی و بنەماڵەكـەی بـەبادینان نـاوی ڕۆیشتووە ،هێندێك لەوانـە كەلـە بنەچـەكەی بهاوالـدین و فـەرمانڕەوایی ئامێـدیان كـردووە ناویـان نـەزانراوە[٤٠]، وای تێدەگـەین بـاس و خواسـی بـوونی سـێ بـراو بەدەسـەڵات بـوونی خێرایـان بـێ بـوونی پێـشینەیەكی مێژووییانەی ڕاستەقینە و بەستنەوەیان بـە عەباسـیان زیـاتر چیرۆكێكی داستان ئامێزەو زۆری پێوە نراوە و ڕەنگـە شـەرەفخانی مێـژوونووس هـەر لە زاری ئەوانەوە بیستبێتی و هەتا ئەویش بەخانە گومانی و بـەپارێزەوە باسـی كـردووە، بۆیـە ئێمـە زانیاریـەكانی مێـژوونوس (العمـري) لـەبارەی

بهاءالـدين و شمـس الـدين ی ئـامۆزای بەڕاسـتتر دەزانـین کـە هاوچـەرخی سەردەمەکە بووە وزانیاری باشی لەسەر کوردان تۆمار کردووە.

لەمـەوە تێدەگـەین کـە بهـاءالـدین   بـاپیرە گـەورەی بنەماڵەیـە و بـەمیر ناوی نەهاتووە، وە لەجێگایەکی دیکەڕا هاتووەتە ئامێدی و ئەمـەش دەری دەخات کەبەمیرایەتی نەهاتووە بەڵکو کاتی ویستووە تا کوڕ یان نـەوەکانی بوون بەدەسەڵاتدار کە هەندێکیان هەر ناویان نەزانراوە، یەکەمین کـەس، لەو بنەماڵەیە، وەکو میر لە شەرەفنامدا باسـکرابێ مـیر زەیـن الـدین ە کـە هاوچـەرخی تـەیموری لـەنگ و شـارۆخی کـوڕی بـووە (کۆتـایی سـەدەی هەشتەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆیەمی کۆچی).

کەواتە دەکـری ْبڵێین هەرچـەندە لـە بنەماڵـەی فـەرمانڕەوای بادینـان لـەپێش مـیر زەیـن الـدین مـیری دیکـەمان نییـە کـە بـە بەڵگـەی تـەواوەوە بتـوانین بیبەسـتینەوە بەهـەمان بنەماڵـە، بـەلأم لـەو چـەند ئامـاژە مێژووییانەی لە توێژینەوەکەدا باسمـان کـردوون وای بـۆ دەچین کـە ئـەو مـیر بهـاءالدینـەی لـە چۆلەمێرگەوە هـاتووە مـەرج نییـە بەدەسـەڵاتداری هـاتبێ، چـونکە لـە شـوێنێکی وەکـو ئامێـدی کـە پێـشتر دەسـەڵاتی کـوردە هەکارییـەکانی لـێ بـووە، ئاسـان نـەبووە کەسـێکی دیکـە بـێ شـەڕ و شـۆڕ دەسـت بگـرێ بەسـەر ناوچـەکەدا کـە کوردەکـانی وێنـدەرێ پاڵپـشتیان نەکردبێ، بۆیە پێمان وایە ئەو ماڵـە میرانـە سـەروکاریان لەگـەڵ ناوچـەی ئامێدی هەبووە، پێدەچێ پێشتر لە سۆنگەی ململانـێ لەگـەڵ زەنگییـەکان و بدرالدین لؤلؤدا لە وڵاتی خۆیان تارابن و دوایی بۆی گەڕابنەوە(٤١)

- هەر لەو سەردەمەدا میرێکی دیکە لە ناوچەکە- هەروەکو پێشتر باسمان کردوە- هەبووە بەناوی (شمس الدین کوڕی بهاءالدین) کە بەمەزەندە لە قەلایەکی نزیك ئامێدی فەرمانڕەوایی کردووە، ڕێی تێ دەچێ هەر لە بنەماڵەی میرانی وێندەرێ بووبێ .

- لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بنەچەی میرانی ئامێدی بەپێی سەرچاوەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچی /چواردەیەمی زاینی هیچ پەیوەندییەکی بەماڵباتی عەباسییانەوە نییە ،هەر لەناو خودی کوردە هەکارییەکان دەرکەوتووەو ئەو دەسەلاتداریەتیە توانیویەتی لە هەل و مەرجی زاڵبوونی مەغۆلەکاندا لە پانتاییەکی سنووردااردا درێژە بەبوونی خۆی بدات .

- سەرەتای دەسەلاتداریەتی کوردە هەکاریەکان لەدەڤەری ئامێدیدا دێرینە، بەلام ئەو بنەماڵەیەی کە میرانی بادینانی لێ کەوتۆتەوە وادیارە لەکۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا بەرە بەرە بالادەست بووبن و دەسەلاتی خۆیان جێگیر کردبێ و ئەو میر زەین الدینەی ناوی هاتووە وادیارە هەرلە پشتی میر عمادالدین اسماعیل بووە، لەویرا بەچەسپاوی دەکرێ قسە لە ڕیزبەندی میرەکانی بادینان بکەین بە ڕوونی دەرك بە دامەزراندنی میرنشینەکە بکەین.

## پەراوێزەکان

١- شـەرەفخانی بەدلیـسی ، شـەرەفنامە ، وەرگێڕانـی : مامۆسـتا هـەژار، چـاپی سـێەم (هەولێر، ٢٠٠٦) ل ١٦١.

٢- بڕوانــە خولاصــەی تــاریخی کــوردو کوردســتان لــەزۆر قەدیمــەوە هــەتا ئیمــڕۆ، ئامادەکردنی: رەفیق صالح. (سلیمانی: ٢٠٠٦ ) ل٢٧٣

٣- وەرگیراوە لە محفوظ العباسی: امارة بهدينان العباسية. (الموصل ١٩٦٩) ص ٣٢ — ٣٨.

٤- الاكراد في بهدينان (دهوك: ١٩٩٩) ص ١١٥ — ١١٨.

٥- بڕوانە کاوە فريق احمد شاوەلی ئامێدی: امارة بادينـان ١٧٠٠- ١٨٤٢ دراسـة سياسـية اجتماعية ثقافية. ( دهوك: ٢٠٠٠) ص٢٩

٦- بڕوانە: منية الادباء في تاريخ الموصل الحدباء، تحقيـق: سـعيد الـديوەجی (الموصل: ١٩٥٥) ص ٢١٨ - ٢١٩.

٧- امـارة بهـدينان الكرديـة أو الامـارة العماديـة، تقـديم ومراجعـة: عبـدالفتاح علـى بوتانی (اربيل:١٩٩٩) ،ص١١،٥.

٨- بڕوانــە: عبــاس العــزاوی، تــاريخ العــراق بــين أحــتلالين (بغــداد، ١٩٤٩) ج٢، ص٦٩؛ العمادية في مختلف العصور، حققه: حمدي السلفي، و عبدالكريم فندي، (اربيـل: ١٩٩٨) ص ٢٩ - ٣٠، محفـوظ العباسـي: المرجـع الـسابق، ص ٢٥ - ٢٦. عمـاد عبدالـسلام رؤوف، الاســر الحاكمــة ورجـال الادارة والقـضاء في العــراق في القــرون المتــاخرة ١٢٥٨ — ١٩١٨ م، (بغداد: ١٩٩٢) ص ٢٠٤.

٩- بڕوانە: رحلة ريض في العراق عام ١٨٢٠، ترجمة: بهاءالدين نـوری، (بغـداد:١٩٥١) ج١، ص ١٠٧.

١٠- اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر خياط، (بغداد: ١٩٨٥) ص١٩.

١١- بڕوانە: مادەی kurd،kurdistan

The new encyclopadia of islam(leiden;1986) vol:v. p.460.

١٢- بڕوانــە: مــادە بهــدينان (بادينــان) دائــرە المعــارف الاســلاميە، الترجمەالعربيــە: (القاهرە:١٩٣٣) ج٨، ص٢٤.

١٣- زامباور، معجم الانساب والاسرات الحاكمة في التاريخ الاسلامي، ترجمة: زكي محمد حسن واخرون، (القاهرة: ١٩٥١) ص ٣٩٢ - ٣٩٣.

١٤-مێژوونوس (ابن ابى لهيجاء الهذباني الاربلي) وێڕای ئەوەی ئاماژەی بەڕووخاندنی قەڵای ئاشب دەكات، یاداشتی كردووە كە قەڵایەكە زۆر مەزن و هەڵەموت و قایم بووە و سەختترین قەڵای كوردەكان بووە، چونكە نەیان توانیوە بیپارێزن هەر بۆخۆیان ڕووخاندوویانە. بڕوانە: تأريخ ابن ابي الهيجاء، تحقيق وتعليق: احمد فريد المزيدى، منشور مع كتاب (تاريخ القضاعي) لابى جعفر القضاعي (بيروت: ٢٠٠٤) ص ٢٢٧ — ٢٢٨.

١٥- بڕوانە: ياقوت الحموى، معجم البلدان (بيروت: د.ت) ج١، ص ٥٤؛ ابن الاثير، الكامل في التاريخ، (بيروت: ١٩٨٢) ج١١، ص١٥.

١٦- ابن ابي الهيجاء الاربلى، المصدر السابق، ص ٢٢٧.

١٧- وفيات الاعيان، تحقيق: احسان عباس، (بيروت: ٢٠٠٥) ج١، ص ١٨٠ - ١٨١.

١٨- بڕوانە: ابن الاثير، المصدر السابق، ج١٢، ص ٣٣٥، ٣٤٦، ٤٤٤، ٤٤٥؛ ابن العبري، تاريخ الزمان، نقله الى العربية: الاب اسحق ارملة، (بيروت:١٩٩١) ص ٢٦٠ - ٢٦١؛ سوادي عبد محمد الرويشدى، امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ، ص١٢٧-١٣٢.

١٩-ياقوت الحموي، المصدر السابق، ج٤، ص ١٤٩؛ ابن العبرى، المصدر السابق، ص ٣٢٣، ٣٢٧؛ ابن الفوطى، مجمع الاداب في معجم الالقاب. تحقيق: محمد الكاظمي، (طهران: ١٤١٦) ج١، ص ١٠٠ - ١٠١.

٢٠- العمري، مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق: محمد عبدالقادر خريسات واخرون، (العين: ٢٠٠١) ج٣، ص١٧٧.

٢١- بڕوانە: القلقلشندى، صبح الاعشى في صناعة الانشاء، شرح وتعليق: محمد حسين شمس الدين، (بيروت: ١٩٨٧) ج٧، ص ٣٠٩ - ٣١٠؛ زرار صديق توفيق: كردستان في القرن الثامن الهجري، (اربيل: ٢٠٠١) ص١٣٨.

٢٢- ابن ناظر الجيش: كتاب تثقيف التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: رودلف ظسلى (القاهرة:١٩٨٧) ص ٧٧. بۆزیاتر ئاگایی لەم بارەیەوە بڕوانە: محمد امين

دوسكي، قراءة في وثيقة تاريخية تكشف عنها النقاب لاول مرة، مجلة متين، (دهوك: ١٩٩٦) العدد/ ٢، ص ١٤٦ - ١٤٧.

٢٣- بڕوانه: مسالك الابصار، ج٣، ص ١٧٥.

٢٤- بڕوانه: شرفنامه، ل١٦١ ، درويش يوسف حسن، بلاد هكارى، ٩٤٥ - ١٣٣٦م دراسة سياسية حضارية،( دهوك: ٢٠٠٥) ص ١٩١.

٢٥- تثقيف التعريف، ص ٨٠،٧٧.

٢٦- بڕوانه: القلقشندى، المصدر السابق، ج٤، ص٣٧٥.

٢٧- العمرى، المصدر السابق، ج٣، ص ١٧٣ ؛ القلقشندى، المصدر السابق، ج٤، ص٣٧٦.

٢٨- دەستنووسى زيوكيه له كتێبى (امارة بهدينان العباسية ) وەرگيراوه ص ٣٢ - ٣٨.

٢٩- بڕوانه: شەرفنامه، ل١٦١.

٣٠- بڕوانه: القلقشندى، المصدر السابق، ج٧، ص٣٠٩.

٣١- شەرەفخانى بەدليسى، سەرچاوەى پێشوو، ل٢٠٤.

٣٢- بڕوانه: قاضي احمد تتوي، تاريخ الفى (تهران: ١٣٨٢)ج٧، ص ٤٤ - ٤٥.

٣٣- بروانه:حافظ ابرو: زبده التواريخ، بتصحيح : سيد كمال حاج سيد جوادى، (تهران:١٣٧٢) ج١، ص٢٥ ،٣٤. رابيعة فتاح شيخ محمد، كوردستان له سەدەى پازدەى زاينى، (هەولێر: ٢٠٠٥) ل ٢٦٦ - ٢٦٧.

٣٤-العمرى، المصدر السابق، ج٣، ص ١٧٥.

٣٥-شەرەفنامه، ل٢٨٠، زرار صديق ، المرجع السابق، ص١٣٩.

٣٦-ابن ناظر الجيش، المصدر السابق، ص ٨٠،بەراوردى بكه لەگەڵ: القلقشندى، المصدر السابق، ج٧، ص ٣١١.

٣٧- زرار صديق، المرجع السابق، ص ١٧١.

٣٨- ابن ناظر الجيش، المصدر السابق، ص ٨٠، ٧٧.

٣٩ —بڕوانه: التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: محمد حسين شمس الدين، (بيروت: ١٩٨٨) ص ٥٨.

٤٠- شەرەفنامه، ل ١٦١.

٤١-لەوبارەيەوه بڕوانه: درويش يوسف، المرجع السابق، ص ١٧١.

# ڕیزبەندی سەرچاوەکان

## یەکەم/ سەرچاوە کۆنەکان

أ- بەزمانی عەرەبی:


ابن الاپیر، عزالدین أبی الحسن علی بن محمد (ت٦٣٠ﻫ/١٢٣٢م)

الكامل في التاريخ، دار بيروت للگباعه والنشر (بيروت: ١٩٨٢)

ابن خلكان، أبو العباس احمد بن محمد (ت٦٨١ﻫ/١٢٨٢م)

وفيات الاعيان وأنباو أبناو الزمان، تحقيق: احسان عباس، دار صادر (بيروت: ٢٠٠٥).

ابن العبری، أبوالفرج جمال الدين بن اهرون (ت ٦٨٥ﻫ/١٢٨٦).

تاريخ الزمان، نقله الى العربية: الاب اسحق ارملة، المكتبة الشرقية (بيروت:١٩٩١)

العمری، أبو العباس شهاب الدين احمد بن يحيى (ت ٧٤٨ﻫ/١٣٤٨)

التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق :محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية (بيروت:١٩٨٨)

مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق: محمد عبدالقادر خريسات واخرون، دار العين (العين: ٢٠٠١).

ابن الفوطي، كمال الدين أبو الفضل (ت ٧٢٣ﻫـ/١٣٢٣م)

مجمع الاداب في معجم الالقاب. تحقيق: محمد الكاظمي، منشورات وزارة الثقافة والارشادالاسلامی (طهران: ١٤١٦).

القلقلشندي، ابو العباس احمد بن علی (ت ٨٢١ﻫـ/١٤١٨)

صبح الاعشى في صناعة الانشاء، شرح وتعليق: محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٨٧).

ابن ناظر الجيش، عبدالرحمن محمد التميمی (ت ٧٨٦ﻫـ/١٣٨٤م)

كتاب تثقيف التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: رودلف ظسلى، منشورات الثقافة (القاهرة: ١٩٨٧).

ابن ابي الهيجاء،الامير عزالدين محمد بن محمد (ت٧٠٠ﻫـ/١٣٠٠م)

تاريخ  ابن ابى الهيجاء، تحقيق وتعليق: احمد فريد المزيدى، منشور مع كتاب (تاريخ القضاعى) لابى جعفر القضاعى، (بيروت: ٢٠٠٤).
ياسين العمري، خيرالله الخطيب (ت ١٢٣٢هـ/١٨١٦م).
منية الادباء في تاريخ الموصل الحدباء، تحقيق: سعيد الديوەجى (الموصل: ١٩٥٥).
ياقوت الحموي، شهاب الدين أبى عبدالله (ت ٦٢٦هـ/١٢٢٩م).
معجم البلدان، دار صادر (بيروت: د. ت).

ب-بەزمانى فارسى:
احمد تتوى، قاضى (ت ق١١هـ/١٧م).
تاريخ الفى (تهران: ١٣٨٢هـ. ش).
حافظ ابرو: عبدالله بن لطف الله (ت٨٣٤ه/١٤٣١م).
زبدة التواريخ، بتصحيح: سيد كمال حاج سيد جوادى، (تهران: ١٣٧٢).

ج-بەزمانى كوردى:
١ـ شەرەفخانى بەدليسى (م١٠١٠ك/١٦٠١ز)، شەرەفنامە ، وەرگێڕانى: مامۆستا هەژار، چاپى سێيەم، دەزگاى ئاراس (هەولێر، ٢٠٠٦ ) ل ١٦١.

سەرچاوەى نوێ
أنور المايى،
الاكراد فى بهدينان، مطبعة خبات، الطبعة الثانية (دهوك: ١٩٩٩).
درويش يوسف حسن ،
بلاد هكارى، ٩٤٥ - ١٣٣٦ م دراسة سياسية حضارية، دار سثيريز للطباعة والنشر (دهوك: ٢٠٠٥).
ريج، كلوديوس جيمس،
رحلة ريض في العراق عام ١٨٢٠، ترجمة: بهاءالدين نورى، (بغداد: ١٩٥١).
رابيعه فتاح شيخ محمد،

كوردستان له سەدەی پازدەی زاینی، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕوشنبیری، (هەولێر: ٢٠٠٥).
زامباور، ادورفون،
معجم الانساب والاسرات الحاكمة في التاريخ الاسلامي، ترجمة: زكي محمد حسن واخرون، مطبعة جامعة فواد الاول (القاهرة: ١٩٥١).
زرار صديق توفيق،
كردستان في القرن الثامن الهجري، مؤسسة موكريانى (اربيل: ٢٠٠١).
سوادي عبد محمد الرويشدي،
امارة الموصل في عهد بدالدين لؤلؤ، مطبعة الارشاد (بغداد: ١٩٧١)
صديق الدملوجي،
امارة بهدينان الكردية الامارة العمادية، تقديم ومراجعة: عبدالفتاح على بوتانى، الطبعة الثانية (اربيل: ١٩٩٩).
عباس العزاوي،
تاريخ العراق بين الاحتلالين مطبعة بغداد الحديثة (بغداد، ١٩٤٩)
العمادية في مختلف العصور، حققة: حمدى السلفى، و عبدالكريم فندى، مطبعة وزارة التربية (اربيل: ١٩٩٨).
عماد عبدالسلام رؤوف،
الاسر الحاكمة ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتاخرة ١٢٥٨ - ١٩١٨م، دار الحكمة للطباعة والنشر (بغداد: ١٩٩٢).
كاوه فريق احمد شاوەلى ئامێدى ،
امارة بادينان ١٧٠٠- ١٨٤٢دراسة سياسية اجتماعية ثقافية. مؤسسة موكرياني (دهوك: ٢٠٠٠).
لونكريك، ستيفن همسلى،
اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة: جعفر خياط، منشورات مكتبة النهضة العربية (بغداد: ١٩٨٥).
ماكينزى، دون،
مادة بهدينان (بادينان) دائرة المعارف الاسلامية، الترجمةالعربية: ( القاهرة:١٩٣٣).

محفوظ العباسی ،
اماره بهدينان العباسيه، مگبعه الجمهوريه (الموصل: ١٩٦٩).
محمد أمين زەكی بگ،
خولاصـەی تـاريخی كـوردو كوردسـتان لـەزۆر قەديمـەوە هـەتا ئيمـرۆ، ئامـادەكردنی:
رەفيق صالح، بنكەی ژين،
(سلێمانی: ٢٠٠٦)
محمد امين دوسكی،
قراءة في وثيقـة تاريخيـة تكشف عنها النقـاب لاول مـرة، مجلـة مـتين، (دهوك: ١٩٩٦)
العدد/٢
kurd، minorsky. kurdistan :
The new encyclopadia of islam(Leiden;1986) vol:v. .

## ملخص البحث

# ( تـأسيس أمارة بـادينـان )

### دراسة تاريخية تحليلية



**د. قادر محمد پشدەرى**

جامعة صلاح الدين –أربيل/ كلية الاداب / قسم التاريخ



**خصصت هـذه الدراسـة (تأسـيس أمـارة بادينـان، دراسـة تاريخيـة تحليليـة ) لمناقـشة مـسألة تأسـيس أمـارة بادينـان وتحليـل ألاراء الـواردة فـى المـصادر عـن فـترة التأسـيس وشخصية الأمير المؤسس وذلك بالأعتماد على المظان القديمـة وايـراد مختلـف الروايـات بهذا الصدد ومقارنتها ومن ثم مناقشتها وبيان رأينا فيهـا في محاولـة لتوضـيح الحقبـة التاريخيـة لتأسـيس ألأمـارة وهويـة المؤسـس ألأمـر الـذى لم يحـسم في المـصادر والمراجـع المتعلقة بتاريخ بادينان .**

**يتكون البحث فضلا عن المقدمة والنتائج من ثلاثة محاور رئيسية:**

**عرض في المحور الأول ألآراء والروايات المختلفة لمؤرخين وباحثين من الكـرد والعـرب العراقيين والمستشرقين فيما يتعلق بتأسيس ألأمارة ومؤسسها.**

**عالج المحـور الثـاني المعلومـات التاريخيـة الموجـودة فـى المـصادر الأصـلية والـتي تخـص تاريخ بلاد هكاري ومنطقة بادينان في العصر الاسلامي وذلك بغية تسليط الضوء على مجمل تاريخ المنطقة، لاسيما في القرنين السابع والثامن الهجريين /الثالث عشر والرابع عشر الميلاديين المدة التي تمتد اليها جذور ألسلطة السياسية لأمراء بادينان .**

**تنـاول المحـور الثالـث مختلـف المعلومـات التاريخيـة المتعلقـة بالبحـث وذلـك بتحليلـها وتعليلها وتفسيرها من خلال مقارنتها بغية أستقراء الواقع التـاريخي المـؤطر للتأسـيس و بداية ظهور سلطة أمراء بادينان .**

# ABSTRACT

## The Establishment of Badinanian Emirate

**Dr. Muhammad Qadir Pishdary**
College of Arts – History Department
Salahaddeen University- Erbil

This study is entitled (The Foundation Of Badinan Principality،A historical analytic study)is concerned with the debate the question of establishment of the Badinan Principality، our methodology in thies research is to compare the novels about the history of (Bilad al-hakary during the Islamic period )

The study is divided in to three sections ،despite of introduction and conclusions .

The first section is devoted to clear the point of views of :Kurdish historian ،Arabic historian and Orientalists about the Foundation Of Badinan Principality.

The second section tackles novels which mentioned in Islamic original sources related to Badinan and Hakkari region history .

The third section is concerned with studying and assessmenting the various informations and facts that releations with the foundation of the principality .

# چیرۆکی حەزرەتی یووسف
# لە دیـــدی شــاعیرە کــا نمـــانــدا

**د. عەبدوڵڵا خدر مەولوود**
زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر/کۆلێژی پەروەردە/بەشی زمانی کوردی

## پێشەکی

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە (چـیرۆکی حـەزرەتی یووسـف لـە دیـدی شـاعیرەکانماندا) ناوەرۆك و بابەتەکـەی شـوێن و پانتاییـەکی فراوانـی لـە بـیر و هـزری نـەك هـەر ئێمـەی موسـوڵمان بـەڵکو ئاییـنـە ئاسمانییـەکانی تـریش گرتـووە. ئـەو چـیرۆك و بەسەرهاتە لە کۆمەڵە ڕووداوێکی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر پێکهاتووە .

ئەم هەموو ڕووداوانەش بە شێوەو شێوازێکی هونەری زۆر جوان، وەکـو زنجیرێکـی نەخـشکراو پێکـەوە بەسـتراون . بـە بیـستن و خوێندنـەوەی لـە سەرچاوەکانداو بە تایبـەتیش لـە قورئـانی پـیرۆزدا، بەشـەوقەوە سـەرنجی بیسەرو خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشی.

شـــاعیرە کۆنـــەکانمان (کلاســـیکەکانمان) خوێنـــدەوار و دەرچـــووی خوێندنی حوجرەکانن. شتێکی بەڵگـە نەویـستە یـەکێك لـە دەرس و وانـە هـەرە گرنگـی ئـەو دەزگـا ڕۆشـنبیرییە فێربـوونی قورئـانی پـیرۆز و ئـەو زانستانەی پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە.

چیرۆکی پێغەمبەران بەشێکی دیـاری ئـەو کتێبـە پـیرۆزە پێـك دەهێـنن و چیرۆکی حەزرەتی یووسف یەکێکە لە چیرۆکە دیار و خۆشەکانی ئەو بەشە.

زۆربەی شاعیرەکانمان ، ناوەرۆك و ڕووداوەکانی ناو ئەو چیرۆکەیان وەرگرتووە و کردوویانن بە وێنەی هونەری شیعری و وەکو نیگار و تابلۆی ڕەنگاو ڕەنـگ بـە

وشە جارێکی تر نیشانی بدەنەوە، یا بەشەوق و زەوقێکی تر بتوانن خزمەتی لایەنێکی ژیان و گرفت و بەرژەوەندییەکانی خودی خۆیان پێ بکەنەوە.

**ئەو باسە لەو بەش و تەوەرانەی خوارەوە پێکهاتووە:**

**- بەشی یەکەم**

**تەوەرەی یەکەم:** کورتەی ژیان و ڕووداوەکانی ناو چیرۆکی حەزرەتی یووسف.

**تەوەرەی دووەم:** نیشاندانی نموونەی وێنە شیعرییەکان ، لە قۆناغی ڕووداوە بەرایییەکان، مەزادکردن و فرۆشتنی لە بازاڕێکی میسردا. یووسف وەکو نموونەیەکی بێ هاوتای جوانی.

**- بەشی دووەم**

**دوو تەوەرەی لەخۆ گرتووە:**

١- زیندانی کردنی یووسف و ئەوەی پێیەوە پەیوەستە.

٢- لەبەر غەمی زۆری ئەو کارەساتە گەورەیەو گریانی بەردەوامی حەزرەتی یەعقووب چاوەکانی لەدەست دا و نابینا بوو. پاشان لەبەر خۆشی ئەو هەواڵەی کە یووسف ماوەو نە فەوتاوە، بە ناردنی کراسەکەی و بۆنی هەردوو چاوەکانی چاك و گەش بوونەوە، وێنەی شیعرییان وەك نموونە نیشاندراوە .

- ئەنجامی باسەکەش لە چەند خاڵێك چڕ کراوەتەوەو ئەوانیش پێش چاو خراون.

- کورتەی باسەکە بە هەرسێ زمانەکان: کوردی، عەرەبی و ئینگلیزی تۆمارکراون. لە کۆتاییشدا لیستی پەراوێز و سەرچاوەکان بە شێوەیەکی تەواو ڕێکخراون و تۆمار کراون.

## بەشی یەکەم

**تـەوەرەی یەکـەم: کورتـەی ژیـان و ڕووداوەکـانی نـاو چیرۆکی حـەزرەتی یووسف(٭)**

یووسف کوڕی یـەعقووب پێغەمبـەرە (د). حـەزرەتی یـەعقووب (١٢) کوڕی هەبوو (یووسف و بنیامین) لە دایکێك بوون و (١٠)یەکەی تریش لە دایکێکی تر بوون.

سـەردەمی یووسـف بـۆ (١٣) سـەدە پ. ز. دەگەڕێتـەوە[١]. دایکـی نـاوی ڕاحیـل بـووە. ئەوەنـدەی تەسـەوڕ دەکـەی جـوان و ڕێکوپێـك بـووە، ئـەو هەموو دەردو بەڵایەی تووشی بووە، هۆیەکەی ئەو جوانییەی بووە.

قورئانی پیرۆز بـە داڕشـتن و شـێوازێك ئـەو چیرۆکە دەگێڕێتـەوە جێـی سەرسـوڕمانە. بـاوکی ئەوەنـدەی خۆشنەویـستووە کـەس بزانـی. یووسـف خەونێك دەبینی و بۆ باوکی دەگێڕیتەوە و دەڵێ: یازدە ئەستێرەو خۆر و مانگ کڕنۆشیان بۆ بردووم. بەو خەونە باوکی دەزانی یووسف دواڕۆژێکی زۆر گەش و پڕشنگداری دەبێت، بۆیە پێـی دەڵـێ ئـەو خەونـە بـۆ کـەس و تەنانەت براکانیشت مەگێڕەوە. نەوەکو ئێرەییت پـێ ببـەن و شـتێکت لـێ بکەن.

هـەر (١٠) برایـەکان لەسـەر ئـەوە ڕێـك دەکـەون یووسـفی بکـوژن و بیفەوتێنن، لەبەر ئەوەی باوکیان لەبەر ئەو، بەری بەوان نییەو ڕووشـیان نـاداتێ. هـەر چـۆنێك بـوو، باوکیـان ڕازی کـرد لەگـەڵ خۆیـان بیبـەن بـۆ سەیران لە دەرەوەی ئاوایی. ئەوان پلانی خۆیان داڕشتبوو، یەك لە براکان گوتی: با یووسف نەکوژین و فڕێـی دەینـە نـاو بیرێـك و بـە قسەیان کـرد.

گەڕانەوە لای باوکیان ، بەدرۆ دەگریان و خۆیان مشەوەش کردبوو، گوایە ئاگایان لە یووسف بڕاوەو گورگ خواردوویەتی ، هەندێ خوێنی بە درۆشیان لە کراسەکەی دابوو نیشانی باوکیان داو دیاربوو باوەڕی پێ نەدەکردن. دەیزانی شتێکی ترە.

کاروانێك لایدا کن بیرەکەو یەکێکیان دەولکەکەی شۆڕ کردەوە ناو بیرەکە بۆ ئاو، هەڵیکێشا تەماشا دەکا کوڕێکی زۆر جوان وا خۆی لەناو دەولکەکە ناوە، زۆر سەیری پێهات و هاتنە تەماشایی و وتیان لەسەر ڕێی خۆمان لە میسر دەیفرۆشین، سەرەنجام یووسف فرۆشراو کەوتە ماڵی عەزیزی میسری مێردی زولەیخای.

یووسف لە ماڵی عەزیزی میسری بە چاوی ڕێزەوە تەماشا دەکرا، تا ئەو ڕۆژەی لەبەر جوانییەکەی زولەیخا تەماعی لێ کردو ویستی بێ ئەمەکی پێ بکات. ڕۆژێکیان زولەیخا دەرگاکان کلیل دەدا و یەخەی یووسف دەگری و ئەویش لەبەری هەڵدێ، لەدواوە دەیەوێ بیگری کراسەکەی دەکەوتە بەر دەستی، لەو ڕاکێش ڕاکێشە کراسەکەی لە دواوە دەدڕێ، ئەوان لەو بینەو بەردەیە دەبن عەزیزی میسری مێردی (زولەیخا)ی دەرگەی دەکاتەوە، بە مشەوەشی و شپرزەیی دەیانبینی. زولەیخا درۆ و بوختانی بۆ یووسف هەڵبەست. یووسفیش چونکە پاك بوو توانی بە چاکی پاکانە و بەرگری لەخۆی بکا.

خزمێکیان بە عەزیزی میسری گوت: ئەگەر یووسف کراسەکەی لە پێشەوە دڕابێ، ئەوە زولەیخا ڕاست دەکا و یووسف درۆ. ئەگەر کراسەکەی لە دواوە دڕابێ ئەوە یووسف ڕاست دەکا و زولەیخاش درۆ. ئەو بەرامبەر بەو پیلانە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، عەزیز پێش ئەو ناوبژیوانەش

دەیزانی ئیشەکـە چۆنە. ئەو ڕووداوە لەناو شار بـڵاو بـۆوە، کـورد دەڵـێ: (قـسە کەتـە زارەکـی، کەتـە شـارەکی). زولـەیخا ژنـە دەوڵەمەنـد و پیـاو ماقووڵانی داوەت کـردو نـارنج و چەقۆیان لـە دەست بـوو، یووسـف لێیـان هاتە پێش لەبەر جوانی ئاگایان لەخۆ بڕاو دەستی خۆیان بڕی.

پاش هەموو ئەوانـە لەسـەر خواسـتی زولـەیخا، یووسـف زینـدانی کـرا. ئەو ڕووداوە سەیرو سەمەرانە هەر بۆ ئەوەن یووسف فاڵ بێتەوەو ببن بە ئـەزموون  چـونکە ئـەوە وردە وردە لـە دەسـەڵات نزیـك دەبێتـەوە، خـوای تەوانا وای ڕێکخست دوو گەنجی تـر لـەو کاتانـە ئـەوانیش زینـدانی کـران. ئەوانیش خەونیان دیت و یووسف تەعبیرەکەی بۆ لێدانەوە، کە یەکێکیان ئازاد دەکرێ و ئەوی تریان سەری لەسەر دادەنێ (ئیعدام دەکرێ).

شەوێکیان پاشای میـسر خـەونێك دەبینـی: حـەفت گـای زۆر قەڵـەو و گۆشـتن لـە زێیەکـە دێنـە دەرێ، حـەفت گـای لـەڕو لاواز دێـن ئـەو حـەفت قەڵەوە دەخۆن. دەبینی حەفت گوڵە گـەنمی سـەوزی جـوان، حـەفت گـوڵی زەردی وشکی بێ خێریان کەوتـە سـەر و دایـان پۆشـین. پاشـا هەرچـەندی کـردی و کۆشـا کـەس نـەبوو تـەعبیری ئـەو خەونـە سـەیرو سـەمەرەی بـۆ لێکبداتەوە. ئەو گەنجەی کە لە زینـدان ئـازاد کرابـوو، غـولامی پاشـا بـوو، گوتی: ئەمن کەسێك دەناسم توانای تەعبیر لێدانی ئەو خەونانـەی هەیـە، زیندانییە، بمنێرە لای من وەڵامەکانت بۆ دەهێنمەوە.

غولامەکە چووە لای یووسـف و خەونەکـەی بـۆ گێـڕاوە. ئـەویش بـێ دوودڵـی گـوتی: ئاوەهـا بـۆ پاشـات بگێـڕەوە: حـەفت سـاڵان هـات دەبـێ، ئاگاداری عەمبار کردنی ئـەو بەروبوومـە زۆرە بـن، چـونکە حـەفت سـاڵان پاش ئەو ماوەیـە گرانـی و قـاتی و وشـکە سـاڵی دەس پێـدەکا، بۆیـە دەبـێ

باش خۆی بۆ ئامادە بکرێ. پاشا بەو قسانە هۆشمەندی و لێهاتوویی یووسفی بۆ بەدیارکەوت، ویستی ئازادی بکا، یووسف ڕازی نەبوو، خەبەری بۆ پاشا نارد بۆ ئەوەی زولەیخاو ژنەکانی تر شاهێدی داوێن پاکی و ڕاستگۆیی یووسف بەرامبەر بە درۆو بوختانەکان ڕوو بەڕوو کا. هەموو ژنەکان بە زولەیخاشەوە شاهێدی ئەوەیان دا کە یووسف یەکێکی مەزن و داوێن پاك و بێ گوناهە.

یووسف زانی پاشا کابرایەکی ڕاست و دروستە، خزمەتگوزارو میهرەبانە گوتی: بمکە بە لێپرسراوی ئازووقەو واریداتی میسر، واتە (وەزیری دارایی و ئابووری). گرانییەکە داهات، پاش ئەو حەفت ساڵەی قات و قڕی، وشکەساڵی برسییەتییەکە نەك هەر لە میسر، بەڵکو وڵات و ناوچەکانی دەوروبەریشی گرتەوە. بۆیە برایەکانی یووسف لە کەنعانەوە هاتن بۆ گەنم کڕین، یووسف خۆی سەرپەرشتی ئەو ئیشانەی دەکرد. کە ئەوان چوونە لای یووسف، زانی و هەمووی ناسینەوە، ئەوانیش نەیاندەزانی ئەو کاربەدەستە گەورەیە برایەکەیانە.

ئەوان خۆیان بە ئەو ناساند، پاشان داوای لێ کردن ئەو جارە زڕ برایەکەیان (بنیامین) لەگەڵ خۆیان بێنن. گەڕانەوەو داوای بنیامینیان لە باوکیان کرد بیبەنە میسر، ڕازی نەبوو، گوتی: دەزانم! چیتان لە یووسف کرد، دەتانەوێ ئاواش لە برایەکەی بکەن. پاشان هەرچۆنێك بوو باوکیان قایل کرد. چوونەوە میسر، یووسف توانی شتێکی وا دابمەزرێنێ (بەناوی دزی) بنیامین لای خۆی گل بداتەوە، ئەوانی تر جگە لە برا گەورەکەیان گەڕانەوەو هەمدیس چەند تۆمەتێکی ناڕەوایان دا پاڵ بنیامین و یووسفی برایان.

گەڕانەوە، ئەو جارەش باوکیان پێیانی باوەڕ نەکردو ئەوەشی بە پیلانێك دانا، دواتر حەزرەتی یەعقووب بە کوڕەکانی گوت: بڕۆنەوە میسر، بەدوای برایەکانتان بگەڕێن و لە میهرەبانی و دلۆڤانی خوای گەورە خۆتان لاتەریك و بە دوور مەگرن.

بۆ جاری سێیەم برایەکانی هاتنەوە میسر، چوونەوە لای عەزیزی میسری (یووسف) پاش قسەو گفتوگۆ: یووسف بەزمانی کەنعانییان لەگەڵیان دواو گوتیان: ئەتو یووسفی؟! گوتی: بەڵێ، من یووسفم و ئەوەش بنیامینی برامە. دیارە هەریەکێك ڕاست بێت، خوای گەورە ڕاستی بۆ دەینی. یارمەتییەکی باشی دان و گوتی: ئەو کراسەی بۆ باوکم ببەن و بەسەر دەموچاوی دابدەن، چاوی چاك دەبێتەوە، پاشان هەموو بنەماڵەو بابیشم وەرنەوە میسر.

یەعقووب هەر لە دوورەوە بۆنی یووسفی کرد، بە بۆنی کراسەکەی هەردوو چاوی چاك بۆوە. بەرەو لای یووسف ڕێیان گرتەبەر. هەموو بەدیداری یەك شاد بوونەوە، ئەو کاتەی چوونە دیوان و بارەگای یووسف، داك و باب و هەر یازدە برایەکانی سەری ڕێزو حورمەتیان بۆ نواند و کڕنۆشیان بۆ برد. یووسف بە باوکی گوت: بابە گیان ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خەونەکەم تێدا بینی، ئەوە هاتە دی.

- تەوەرەی دووەم

نیشاندانی ئەو وێنە شیعرییانەن کە قۆناغەکانی سەرەتاییمان بەبیر دەهێنێتەوە.

سابری دەڵێ (٢):

یووسفی دڵ موزمەحیل ماوە لەنێو بیری فیراق

کوا موسڵمانێ بزانی چارو تدبیری فیراق ١١٢(★)

یووسفی دڵی شاعیر، کەوتۆتە نێو چاڵ و بیری دووری، وەك ئەوەی هەر بوونیشی نەمابێ و توابێتەوە ڕۆیشتبێ. هانای بۆ کەسی سێیەم دەباو دەپرسێ کوا؟ ئەو موسڵمانە ژیرە سەری لەو دوورییە دەربچێ و تەگبیر و چارەسەریەکی بکا.

بێخود دەڵێ (٣):

ئەی فیدای ڕەحم و وەفاتان بم مەگەر من یۆسفم

ئەم برای خۆتانە ئاوارە وو ون کردووە ٩٣

من بە فیداو قوربانی ئەو دلۆڤانی و وەفایە زۆرەتان بم، مەگەر بە یووسفم تێدەگەن، ئەمە برای خۆتانە، هەر هیچ نەبێ نابێ ون و گومی بکەن. ئەگەر نا دلۆڤانی و وەفاو میهرەبانی یانی چی؟!

کەمالی دەڵێ (٤):

هەر وەکو یوسف (کەمالی) تۆ بچۆ ناو بیرەوە

چی ئەبێ بام مەسکەنت بالاّ وەکو عیسا نەبێ ١٣١(★)

کەمالی بە خۆی دەڵێ: چی تێدایە، وەکو یوسف ژیان لە ناو بیرو چاڵ بەسەر ببەو بیگوزەرێنە. چی دەبێ ئەگەر شوێنی حەوانەوەت وەکو

شوێنی حەزرەتی عیسا بەرزو باڵا نەبێت. کەمالی بە خۆی دەڵێ بچۆ، بەڵام حەزرەتی یووسف بەخۆشی خۆی ناو بیری بۆ خۆی هەڵنەبژارد بوو.

بە هەمان بیرو کەرەسە کەمالی وێنەیەکی ترمان نیشان دەداو دەڵێ[٥]:

چەشنی یوسف تۆ بچۆ ناو بیرەوە ببیە غەریق
یا بچۆرە ئاسمان تەنیا مەسیحایی بکە ١٠٣

سەلام دەڵێ [٦]:

کورد وەکو یەعقووبە ئامالی وەکو یوسفی عەزیز
تف لە گورگی پیر ئەکا نەفرەت لە چاڵ و بیر ئەکا ١٤٩

شێخ سەلام هەندێ کەرەسەو هێمای لە ڕووداوەکانی چیرۆکەکەی یووسف لەو دێرەی بەکارهێناوە (یەعقووب، ئامال، یووسف، عەزیز، گورگ، بیر) کە بەکارهاتەکانی ئەو هێماو نیشانانەی بۆ بابەتێکی تری بەکارهێناوە، ئەویش خۆڕاگری میللەتی کوردە. لەو دێرە چوار لە خەسڵەتەکانی کوردی نیشان داوە، ئارامی و خۆڕاگری وەکو یەعقووبە، هیوای زۆرو گەشی دواڕۆژی وەکو یووسفە، هیچ کاتێك منەتی گورگی نەزانیوە هیچ حسابێکی بۆ نەکردووە، هەردەم نەفرەتی لەچاڵ و بیر، شوێنی تەنگ و تار کردووە. لای کورد ئەو کات و دەمەی ئازادە ئەوە ژیانە و ئەوانی ترنە.

خادیم دەڵێ [٧]:

**دەمێکە هەروەکو یوسف کە لێم ون بوو لە پیرا هەن**
**کەوا جانی عەزیزم بوو لە خانەی ئاو و گڵ غائیب ١٠٦**

**خادیم باس لە ونبوونێك دەکا، وەکو ونبوونی یووسف لە یەعقووبی باوکی. دواتر دەڵێ: ئەو کراسەی چاوی یەعقووبی بینا و گەش کردەوە، من ئەو کراسە لەکوێ بدۆزمەوەو پەیدای کەم. بە ئاو و گڵەکە هەر هەبێت کە گیانی عەزیزو خۆشەویستی تێکەڵ نەکرێت بەچی دەچێت.**

دیسان دەڵێ [٨]:

**لە کولبەم دا دەبارێنم لە چاوم ئەشکی خوێنینم**
**لە دووری یوسفی گومبوو کە وا من زارو غەمگینم**
**دەسا ئەی کاروان کوا پیرەهەن تا ساتێ ببینم ؟**
**تەواوە حاڵەتی ژینم لە دەست چوو ڕۆحی شیرینم**
**رەفیقان بێن بکەن شینم سەدای گریە و فوغان بابێ**

**ئەو نموونەیە لەو پێنج خشتەکییە وەرگیراوە، کە خادیم لە سەر غەزەلەکەی تاهیر بەگی جاف داینـاوە. پاش چەقی ئەم پێنج لەتە کە گومبوونی یووسفە، دوو هێمامان نیشان دەدا (کاروان، پیراهەن ) ئەو بە کارەساتەکەی گومبوونەکە چاوی لەدەست داوە، بۆیە چاوەڕوانی هاتن و**

گەیشتنی ئەو کاروانەیە کە کراسەکەی بۆ هێناوە، تا بە بۆنەکەی بینایی بۆ بگەڕێتەوە.

قانیع دەڵێ [٩]:

ئەی وەتەن ! یەعقوبی تۆم و، یۆسفم لێگوم بووە
ئەی وەتەن ! بەدناوی تۆم و، ئابڕووم بۆ تۆ چووە

لەو دێرە قانیع ناوی یەعقووب و یووسفی هێناوە، بانگ لە وەتەن دەکاو وشیاری دەکاتەوەو دەڵێ: من یەعقووبی تۆم و یووسفم لێ ون بووە، هەر لە بەر خاتری تۆشە خەڵك بە خراپە باسم دەکەن و ناوم دەهێنن، بوومەتە بنێشتە خۆشەی سەر زاریان. شەرەفێکی گەورەیە دوژمنانی نیشتمانم ئەو بیرو بۆچوونەیان بەرامبەر بە من هەبێ.

ئەو نموونە شیعرییانەی بۆ کڕین و فرۆشتنی یووسف وەرگیراون

جزیری دەڵێ [١٠]:

بدیناری دنێ زینهار دا یاری خوە نەفروشی
کەسێ یوسف فرۆتی وی دعالەم دا خەسارەت کر ٢٨٨

مەلای جزیری بەو دێرە شیعرە دوو نیشانی پێکاوە. یەکەم: پارە هی ئەوە نییە، ئەو بەهاو هێزەی نییە بەرامبەر بەیار و خۆشەویست

**بوەستێت و سەودای ئەوی پێ بکرێ. بە واتایەکی تر: خۆشەویست لای مرۆی ئاسایی نرخی لەسەر نییە بۆ فرۆشتنی. دووەم: ئەوەمان بەبیر دەهێنێتەوە، ئەوەی یووسفی فرۆشت، هەر ئەو کەسە لە جیهاندا زەرەرمەند بوو، ئینجا بزانە ! لەو زەرەرەی یووسف بە پارەیەکی زۆر کەم بەرامبەر کەی و لە دەست خۆتی بدەی.**

**ڕەنجووری دەڵێ (١١):**

**شەخصێ کە (یوسف) زەڕ خەریدش بۆ**
**چ خاسەن غەم پۆش غەم کەشیدش بۆ ١١١**

**کەسێ کڕیاری حەزرەتی یووسف بێت و بەپارەو دراوێکی زۆر بیکڕی، چەند جوانە ئەو غەمەی کە یووسفی تێ کەوتووە، وەکو کەشیدە لەسەر خۆی دابنێ.**

**پەرتویێ هەکاری دەڵێ (١٢):**

**ئەو یوسفێ مصرێ مثال وێ هاتە بازارێ جەمال**
**من جان و دل ئینانە بال گۆدێ هەرەکاسد مەتاع ١٤١**

**پەرتویێ هەکاری وێنەیەکی ناسکی بۆ نەخشاندووین، ئەو وەکو یووسفی میسری کە نموونەی جوانی و قەشەنگییە، هاتۆتە بازاڕی جوانی. پەرتو بۆ کڕینی گیان و دڵ دەدا، پێیانگۆ: بڕۆ بڕۆ!! چ شتومەکێکی بێ نرخ و کەڵکی پێیە بۆ سەودا کردنی بازاڕی.**

دیسان دەڵێ [۱۳]:

**یوســف کــەرەم و نینـــە بهــا لێــك وەکــی پــیر**
**نقــدا دل و جــان پــەرتوی ئینانديــە بــازار ۱۲۲**

ئـەو جـارەش پـەرتو دڵ و گیـانی خـۆی هێناوەتـە بـازاڕو بـەو شـتانە دەیەوێ ببێ بە کڕیاری یووسف.

نالی دەڵێ [۱٤]:

**گـەر ئەشـرەفی مەحبووبـە، یووسـف کـوڕی یەعقووبـە**
**کچ بوو بـــە خریداری یـــەعنی کــــە زولەیخا کـچ ۱۳٦**

نالی لە نیوە دێری یەکەم، بەڕێز و حورمەتـەوە نـاوی یووسـفی کـوڕی یەعقووبی هێناوە. لەنیوەی دووەم دەڵێ: زولەیخا بە خۆی کڕیاری یووسف بووە، باس لە مێردەکەی ناکا، کە عەزیزی میسری بووە.

مەولەوی دەڵێ [۱٥]:

**یــــــەکێ وەمـــــــایەی گــــــەنج (کــــەی)ەوە**
**چـــۆن منـــیچ وەتـــای فـــەرتووت نەیـــەوە ٤٧**

لـە دیـوانی مەولـەوی، ئـەو دێـرە وا لێکدراوەتـەوە: (مایـە: سـەرمایە. کەی: کەیخەسرەو ، ئەڵێن پادشایەکی دەوڵەمەنـد بـووە. منـیچ . تـا: تـاڵ.

فـەرتووت نـەی: دەزووی رزیـو. واتـە: هەنـدێ کـەس لـەم سـەودایەدا سەرمایەی دەستیان گـەنجی کەیخەسـرەوە. منـیش دەسمایـەم تاڵـە دەزووی رزیوە. ئەم شیعرە ئیشارەتە بۆ چیرۆکەکەی فرۆشتنی حـەزرەتی یووسـف کە پیرەژنێکیش هاتبوو کلاّفەیێ دەزووی پێ بـوو ئەیویـست یووسـفی پـێ بکڕی !)(*).

مەلا وەسمان دەڵێ (١٦):

مـەتاعی ئـەر جـانی مـن بـێ موشـتەری عیـشق
بـە سـێ درهـەم وەکـو یوسـف بـە بـازار ٦٧

هـەر شـتومەکێك کەوتـە بـازاڕ، بـۆ هەنـدەکان گـران و بـۆ هەنـدێکی ترهەرزانە. بزانە یووسف لە بازاڕدا چی بە سەرهات.

دیسان دەڵێ (١٧):

شکەسـتی نرخـی حوسـنی یوسـفی تـۆ
بـە تیغـی عیـشقی تـۆ دەسـت و ترنجـە ١٢٨

مەلا وەسمان لەو وێنە شیعرییەدا، باس لـەو کاتانـە دەکا کـە زولـەیخا ژنەکانی دەوروبەری بانگ کردبوو، بۆ ئەوەی یووسفیان نیـشان بـدا. بـاس لە جوانی یووسف کراوە، تیغ و ترنجیش نیشانەی دەست بڕینیانە.

مەحوی دەڵێ [18]:

**مـنم وەك ئـەو زەعیفـە، ئـەو قەصـیدە، ئـەو گلـە دەزووە**
**ئـەمـن کـڕیـاری مـاهـی (لا مكان) ، ئەو ماهی کەنـعانە ٤٥٥**

ئەم دێرەی مەحوی هەمان ئیشارەو لێکدانـەوەی دێرەکـەی مەولـەوی بە خۆ دەگرێ: باس لە هەمان پیرەژنە هیچ نەدارو بێ دەسـەڵاتەکە دەکـا، کە بە خۆو بە گلۆڵە دەزووەکـی پـچڕ پـچڕ بەشـداری لـە مـەزات و کڕینـی حەزرەتی یووسف دەکا.

گوایە پێیان وتووە: ئەوە چۆن کارێکەو نابێ!! لـە وەڵامـدا وتوویـەتی: خۆ هەر نەبی دەڵێن ئەوەش کڕیارە!

حەریق دەڵێ [19]:

**کـەسـی فیترەت بـڵـند بی بـۆ رەواجـی سـکەی دیـنـی**
**خەراجی مصری قەلبی خۆی بە حوسنی یوسفی داوە ٦١**

ئـەو کەسـەی خـاوەن سروشـتێکی بـەرزو بڵـنـد بێـت، بـۆ بـە هـەرمێن کردنـی ڕێـڕەوی ئـایینی، دەبـێ هـەموو خەرجییـەکانی ولاتـی میـسر و دڵەکەی خۆشی بە جوانییەکەی یووسفی داوە .

تاهیر بەگی جاف دەڵێ [20]:

**وەکو یووسف ئەگەر چی مشتری وەستاوە صف در صف**
**وەکـــو ((طاهر)) نییە امرو بـــەجان و دل خریداری ٣٧**

تاهیر بـەگ وەك بڵێـی تـەرازووەکی لـە دەسـتەو ناوەندەکەی گرتییـە. دەڵێ: بازاڕی یووسف گەرم و قەرەباڵغە، کڕیارو مشتەری سرەیان گرتییـە و خۆی بە جۆرێك نیشان دەدا. بـەلاٚم کـە لێـی ورد دەبمـەوە کەسـیان ئـەو گڕو تینەی منیان نییە، بە ڕاستی کڕیار هەبێ هەر منم، چونکە من گیان و دڵی خۆم لە قەبەری دەدەم و هیچ باکیشم نییە.

حەمدی دەڵێ (٢١):

(حەمدی) لەم بازاڕەدا سەودای بە دڵ کرد نەك خەیاڵ
گــــەوهەرێکە قیمەتی یــووسف نەوەك نیوەی کەلاٚف ٣٤٣

دەڵێ: حەمدی هاتۆتە بازاڕو ئەویش کڕیـارە، لەبـەر ئـەوەی کەسـێکی خەیاڵی نییە، بۆیە دەزانی شتێك خۆی قیمەتی هەبێ، قیمەت دەکا. واتـە گەوهەر نرخ و بەهای هەر گەوهەرە، نەك شتێکی تر.

دیسان دەڵێ (٢٢):

لـە بــازاڕی موحیبــەت مـشتەری لــــەو مــــاهە حـەیرانن
ڕەواجی حەزرەتی یووسف کە کەمتر بێ لە قول چی بکا ٢٣٤

ئەهلی بـازاڕ بـە کڕیارەکانیـشەوە ، مـات و حـەیرانی ئـەو مانگـەن کـە نموونـەی حۆرییـەکانی ئاسمـانن، ئـەو پلـە مومتازانـە لـە بـازاڕدا مـەزات بکـرێن، کـێ بـەری بـە لای یووسف دەبـێ. یووسـف چـی لـە دەسـت دێ، ڕەواجی نەمایەو قولە ڕەشێك نرخەکەی لە ئەو زیاترە.

سافی دەڵێ [٢٣]:

**مـوڵکی میـسرم بـۆ چییە ؟ گـەر مـاهی کـەنعانم هـەبێ**
**چیـم لـە بـازاڕی زولـەیـخـا یـوسـفی ســەودا دەکـەم ١٧٣**

ئەگەر ئەو ماهی کەنعانی هەبێ واتە (حـەزرەتی یووسـف)، چـاوی لـە هـەموو وڵاتـی میـسر نییـە. ئـەو عـەوداڵی شـتێکە و هـەر ئـەوی دەوێ. مشتەری یووسفەو هاتووە ئەو دەکڕێ، هیچ پەیوەندی بە زولەیخاوە نییـە و هەر ناشی ناسێ.

زێوەر دەڵێ [٢٤]:

**بـە بـاڵای بـەرز و سـوخمەی سـەوزو تـەرزی دلبـەری تـاقی**
**کـــەوا تـــاقەی عیراقی، زۆرە وەك یـــوسف خریـدارت ١٣٦**

یەکێك ئەو هەموو سیفاتانەی تێدابێت وەکو یووسف کڕیارو مشتەری زۆر دەبێت، باڵای بەرز بێت، سوخمەی بەری سەوزو تـەرزێك بێت، لـەناو دلبـەرەکانیش تـاق و تاقانـە بێـت، نـەك هـەر ئەوەنـدە لـە عیراقـیش بـێ وڵداش بێت، دیارە ئەوانە لە بازاڕدا نامێننەوە.

دیسان دەڵێ [٢٥]:

**بـــازاڕی هـــەموو گرتـــووە. وەك یوســـفی ثـــانی**
**لافــی ئـــــەوەیە زینـــدە بکـــا دینـــی یـــەهـــوودا ١٢٧**

زێوەر باس لەیەکێك دەکا، مەغروورو لووت بەرزە، چۆن یووسف بە جوانییەکەی سەرنجی ئەوانەی بازاڕی ڕاکێشابوو، ئەویش بەو جۆرە. سەرەڕای ئەوە لاف و فیزی ئەوەش لێدەدا شتە ئەفسانەییەکان بکا بە واقیع (وەك زیندوو کردنەوەی ئاینی یەهودی).

سابری دەڵێ (٢٦):

کە یوسف هاتە بازاڕ هەمو کەس تالیب و کڕیار

منم بێ درهەم و دینار غەزەل خوانی (بضاعە)تمە ١٤٩

بزانە ! ئەو بەخت و شانسەی سابری، یووسفیان هێناوەتە بازاڕ هەموو کەس چاوی لەوە بوو ببێ بە مشتەری یووسف، بزانە کێ بەختی یار دەبێ! شاعیرمان نەك دینار بەڵکو درهەمیشی نەبووە، بزانە ئەو مشتەرییەی!! قسەیەکی زۆر جوانی کردووە (ئەگەر پارە بکا) دەڵێ: شتومەکی سەوداو گۆڕینەوەم غەزەل و غەزەلخوانییەکەمە.

بێخود دەڵێ (٢٧)

عەزیزان بۆ قوماشی یۆسفی عیشق

خڕیدارێکی بێ پەروایە (خادم) ٤٦

بێخود ئەو قەسیدەیەی بۆ (خادیمی سەججادەی کەرکوکی) نووسیوە، وشەی (خادم) لەو شیعرە پاش سەروایە. خادیم کڕیارێکی سەربەست و بێ پەروایە، ئەگەر بۆن و کراسەکەی یووسف نابینا و کوێر چاك بکاتەوە، کڕینی ئەو کەسە هەڵوەستەی دەوێ؟!

دیسان دەڵێ [٢٨]:

**وەها بازاڕی حوسنی گەرمە (تـوفیق) وەك (عەزیز)ی خۆم**

**خــەریکی ڕۆحــە بیدا مــوشتەری گـــەر مـــاهی کـەنعانە ٨٩**

**بێخود لـەو شـیعرەی نـاوی کەسـانێکی زۆری هێنـاوە، لەوانـە (تۆفیـق، عـەزیز) کـە دوو دۆسـتی خـودی شـاعیر بوونـە لـەو دێـرە تۆمـار کـراون. ئەوانەش وەك ماهی کەنعان (حەزرەتی یووسف) بازاڕیان گەرمـە، لـە بـەر حوسن و جوانییان مشتەری نا حەق نییە ئەگـەر گیـانی خـۆی سـەودا پـێ بکا.**

خادیم دەڵێ [٢٩]:

**دڵـی موفلیــس خەریـداری جـەمـالی یوسـفە ئیمڕۆ**

**لە بازاڕی محەببەت عیشق ئەگەر سەودا نەکا چبکا ١٠١**

**دڵـەو هیـچی نییـەو شتیـشی دەوێ، ئەوەتـە موفلیـسەو یـەك فلسیـشی نییـە کڕیـاری یووسـف و جوانییەکەیـەتی. لـەبازاڕی خۆشەویـستی ئەگـەر بەو جۆرە عیشق سەودا نەکا چی تر بکا. وێنەیەکی شـیعری ناسـك، چـاك بوو پیرەژنەکە کلاڵفە دەزووەکی پێ بوو، یووسفی پـێ بکـڕی، ئەوەتـە دڵـی خادیم موفلیسەو ئەوەندەیشی پێ نییە.**

دیسان دەڵێ [٣٠]:

**وەك خریدارانی یـوسف بــەم مەتاعەی زۆر حەقیر**

**جـان و دڵ بۆ بەیعی وەسڵی تۆیە گرتوومە بەکەف ١٥٥**

وەکو کڕیارەکانی تری یووسف، کەلوپەلی سەوداو گۆڕینەوەم ئەوەنـدە کەم و بێ قیمەت و هیچ و پووچە، تەماشاکە ئەوەتە گیان و دڵم بەدەست گرتووە و ئەو بـازاڕەی پێدەکـەم شـتەکی پـێ بـدەن (دەیفرۆشـم) هـەر بـۆ ئەوەیە بە وەسڵی تۆ شاد بم.

دیسان دەڵێ (٣١):

زۆر بـەهەرزان ئەیفرۆشی ئەم حەسوودەی مەندەبۆر

ئیستە لـــەم بـــازاڕەدا وەك یـــوسفی کەنعانە کـــورد ٢٢

ئەو دێرە بەوشەکانی تابلۆیەکی جوان و ڕەنگاوڕەنگی لـەخۆ گرتییـە. چۆن بەهەرزان نایفرۆشی! ئەو ڕەزیل و قرچۆکە ئێرەیی بە هـەموو شـت دەبا. لـەو بـازاڕەدا یووسـف چۆن بـوو، کـوردیش وەکـو ئـەوە (هـیچ کـەس حیسابیان بۆ ناکەن). فەرموو بزانە نرخیان چەندە !

شێخ نووری دەڵێ (٣٢):

چـۆن ئـەبێ یـەك بـێ لـەبازاڕی مـرووەت مەنـدان

قیمـەتی یووسـفی میـسری و غـولاّمی حەبەشـی ٦٠٢

شـێخ نـووری زۆر بەڕاشـکاوی و بـەدەنگێکی بـەرز دەپرسـێ و پاشـان پەنجەی ناڕەزایی بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: چـۆن دەبـێ بەیـەك چـاو تەماشـا بکرێ و لەبازاڕدا یەك نرخیان هەبێ. ئـەی خـاوەن ویژدانـەکان لـە کـوێن، یووسفی میسری و غولاّمێکی قولی حەبەشی وەکو یەك بن.

سەفوەت دەڵێ [٣٣]:

**لــە شــيعرت دەســتت پــڕ گەوهەرکــە يووســف**
**لـــە بـــازاڕی مـــەزات ئـەكـــرێ هـەراجـــی ٨٩**

سـەفوەتيش دەچـێتە بـازاڕو بەشـداری ئـەو مەزاتكردنــە دەكـا كـە يووسفی تێدا دەفرۆشرێ. لە شيعر زياتر هيچ شتی تری نييە، وشەو دێرە شيعرەكانی بە گەوهەر چواندووە بۆكڕينی، نرخەكەی يووسفيشی ديـاری كردووە، كە ئەويش (مست، يا چەنگە) گەوهەرێكە.

**يووسف وەكو نموونەيەكی بێ هاوتای جوانی**

جزيری دەڵێ [٣٤]:

**يــوســـفی ثـــانی تـــو ئـــيرۆ خـــانم**
**كـــو بحوســـنا خـــوە نـــە ديـــری ثـــانی ٥٠١**

(تۆ ئەمڕۆ يەكەمين جوانی لە دنيادا، ئەگەر لەمێژووش بنۆڕين، تـۆ لەپاش يوسف دووهەمی و بۆ خۆت هيچ دووهەمت نييە)(٭).

ڕەنجووری دەڵێ [٣٥]:

**ديـــاش ڕووی يوســف جـــەو ســـەما وە زەوق**
**نەحوسـن و جـەماڵ چـوون نوورمـدا شـەوق ٤٥**

كــە ڕووی يووســفی بينــی بەخۆشــی و زەوقــەوە كەوتــە ســەما و چەرخدان، لەنێو نيگای حوسن و جوانی شەوقی دەدايەوە، يا نـوور لـەدەم و چاوی دەباری.

پەرتوییێ هەکاری دەڵێ [٣٦]:

**یوسـفی حوسـنێ ت (مـصرا) سـینه حینـا بـو عـەزیز**

**کینیا اخـوان نخوت چـو ژ هــەر (مفتـون) کـەس ١٣٢**

پەرتو لەو دێرە باس لە (جوانی یووسف، وڵاتـی میـسر، عـەزیز، ڕق و کینی برایەکانی بەرامبـەر بـە یووسـف، شـەیداو عـەوداڵ بـوونی زولـەیخا) دەکا. هەموو ئەمانـەش پەیوەسـتن بـە ژیـانی پاڵـەوان و ڕووداوەکـانی نێـو چیرۆکەکە.

دیسان دەڵێ [٣٧]:

**دوو ئــەبرۆ قبلــە پاکــان مــژە تیــژن وەکــی پــەیکان**

**گرشمـە قــاتل و فـەتــان ســـەراپا یــوسفی ثـــانی ٢١٤**

هەردوو ئـەبرۆت ڕووگـەی پـیرۆزن، برژانگـەکانت وەکـی سـەری تـیران تیژو بەکارن. بەناز تەماشا کردنەکەت کوشندەو دڵفرێنە، سەرتاپا و سـەر لەبەرت یووسفی دووەمی.

نالی دەڵێ [٣٧]:

**تۆ یووسفی نەو حوسنی لەسەر میسری جینانی**

**من پیرم و فانی**

**لەم کولبەیی ئەحزانە نـەزیندووم و نــەمردووم**

**هـەروا بەتەماتم**

نـالی لـەنیوه دێـری یەكـەم بـاس لـە پێغەمبـەر(د) دەكـا، دەڵـێ: تـۆ یووسفی، هەردەم جوانییەكەت تازەیە و تێك ناچێ، كەم و زۆر گۆڕانی بە سـەردا نایـەت، ئـەو لـە ولأتـی میـسرو بـەڕێزتان لـە بـاغ و باغـچەكانی بەهەشت. منیش چۆن بوونەوەرێكم: پیرو بێ هێز، بەرەو نـەمان هـەنگاو دەنـێم، لـە كۆڵێتێـك كـەوتووم لێـوان لێـوە لـە غـەم، ئەوەنـدە بـێ كـەڵكم نازانرێ ماوم یا مردووم، ئەوەندە هەیە هـەتا نەفەسـم بێـت و بـچێ هیـوا بڕ نابم و هەر بە تەماتم.

سالم دەڵێ [٣٨]:

كـەفـــی عـەقلـــی بـــڕی دڵ وەك زولەیخــــا

بــە تیغـی غـەم لـە عیـشقی مـاهی كــەنعان ٨٩

بە دیتنی حوسن و جوانی یووسف، ژنـەكان دەست و ناولـەپی خۆیـان بڕی، یا زولەیخا عەقلی بڕی شتێكی وا لە گـەڵ ژنـەكان ساز بكاو تووشـی سەرسوڕمانێكی وا بن دەستی خۆیان ببڕن. ئێستاش دڵ بـە تیغـی غـەم لـە عیشقی ماهی كەنعان واتە (یووسف) دەیەوێ ئەو دەورە ببینی.

دیسان دەڵێ [٣٩]:

كـە شـوعـلەی طـەلعـەتی یوســف طلـوعی كـرد بەچـی زانـیم

(كە عیشق ئەز پەردەیی عیصمەت بیرون ئارد زولـەیخارا)[*] ٢٤

هـەڵاتن و دەركـەوتنی شـەوق و ڕوونـاكی ڕوخـسارو سـیمای لـە ڕاددە بەدەری یووسفم بەوە زانی، كە عیشق و خۆشەویـستی ئـەو پەردەیـەی لـە نێوان زولەیخاو هەڵەو خراپە یا (عیسمەت)هەبوو نەیهێڵێ.

مەولەوی دەڵێ [٤٠]:

**مـــشـكـیـنـە خـالــێ ، یۆســـف جـــەماڵێ**

**مــەحبووب جــەلالێ ، لــەیل ئاســا حــاڵێ ٥٢٥**

خــاوەن خــاڵێكی بــۆن خۆشــی وەك میــشك، جــوان و ڕوخــساری وەك یووسف، خۆشەویستێكی بەشان و شەوكەتی بێ باك، حاڵ و هەڵسوكەوتی وەكو لەیلایە.

مەلا وەسمان دەڵێ [٤١]:

**لــە خــاتر لــوتفی تــۆ بــوو ئــان حوســنت**

**سەبـــاحی یـــوسف و عیـــشقی زولـــەیخا ١٩٢**

لەبەر خاتری ئەو لوتفەی دەنوێنی، كە خاوەنی ئەو حوسن و جەمالەشی، حاجی دەڵێ [٤٢]:

**صــورەتگەری ســـەر لەوحـــەیی دیــوانی مەلاحـــەت**

**دوو یــووسفی كێـشاوە بـــەبێ ئـــەووەل و ثـــانی ١٦٩**

نەققاش و وێنەكێشی سەر لەوحەی تـابلۆی دیـوانی جـوانی، نـەقش و وێنەی دوو یووسفی كێشاوە، كە یەكەم و دووەمیان نییە.

وەفایی دەڵێ [٤٣]:

**گـوڵێكم بــوو لـــە بـــاغی دولبەریـدا مـــاهی كـەنعانی**

**دڵێكم بوو لەڕیزەی عاشقان مەجنوون بەسووتانی ١٠٦**

وەفایی باس لە گوڵەکەی خۆی دەکا، لەباغی دلبەری کە نازناوەکەی هێناوە (ماهی کەنعانی) واتە یووسفی کوڕی یەعقووب. پاشان با بزانین کێیە ئەوەی دڵ دەباو دڵبەرە، ئەوە کەسێکە کەوەك کەسانی تری ئاسایی نییە لە جوانی و قەشەنگی، بێ خەوشی لەزۆر لاوە، بەکورتی وەك یووسف بووە.

ناری دەڵێ (٤٤):

لەبۆ ئەربابی شەوکەت لازمە زیبی هەوا خواهی
ڕەواجی حوسنی یوسف، شۆرشی عەشقی زولەیخا بوو ٧٩

ئەوانەی گەورەن و خاوەن پلەوپایەی بەرزن، بۆ ئەوان زۆر پێویستە ئارەزووی ڕێك پۆشی و خۆڕازاندنەوەیان هەبێ، ئەو پێش چاوی و بازاڕ گەرمییەی یووسف جوانییەکەی بوو، ئەو شۆرشەی لە عەشقی زولەیخا دروست کردبوو.

دیسان دەڵێ (٤٥):

نەقشی مانی دەرکەوێ نەققاشی چین ریسوا دەبێ
حوسنی یووسف جلەوگەر بێ زینەتی شیرین چییە ١٠٧

کورد لەمێژە ئەوەی بڕاندۆتەوە، ئەگەر شتی باش هەیە، لەویش باشتر هەیە. نەققاشی چینی زۆر بەناوبانگ و هونەرمەندن، ئەمە ڕاستە، بەلاّم ئەوانە بەرامبەر بەدەست و خەت و نەخشی مانی دەکرێن و ڕادەوەستن!! ئەوەتە ناری دەڵێ: ڕیسوا دەبن. ئەگەر جوانی و قەشەنگی یووسف جلەو گەر بن زینەتی شیرین لە کوێ خۆی دەدۆزیتەوە.

حەمدی دەڵێ [٤٦]:

**یووسـفی من سـەد زولەیـخا عاشـق و مەفتوونییە**

**سەد هەزاری میسلی لەیلا هەر وەکو مەجنوونییە ٢١٦**

خەڵکانێکی زۆر شێت و شەیدای زولەیخاو لەیلان، ئەو دێرەی حەمدی پێچەوانەی هاوکێشە گشتییەکەیە. ئەو دەڵێ: یووسفی من لە بـەر ئـەوەی نموونەی جوانییە نەك یەك زولەیخا، بەڵکو سەد زولەیخا شەیداو عەوداڵی ئەون، نەك هەر ئەوەندە سەد هـەزاری وەکـو لـەیلا شـێت و دێوانـەی ئـەو یووسفەی منن.

ئەحمەد موختار بەگی جاف دەڵێ [٤٧]:

**بڵـێ قـوربـانی تـۆبم ئـەی سـەلاحـەددینی ئـەییوبی**

**بە زۆری پەنجە وەك حەیـدەر، بـە سـیما یوسـفی ثـانی ١٦٩**

ئەو دێـرە لـەو شـیعرە وەرگـیراوە کـە بـۆ شـێخ مـەحموودی نووسـیوە، ئاشکرا دیارە ستایشی ئەو دەکا. لە نیوە لەتی دووەمـی، نـیوە دێـری دووەم بـاس لـە سـیمای یووسـفی دووەم دەکـا. ئەمـەش دیـارە نازنـاوی ئـەیازی وەزیری سوڵتان مەحموودە، بە ڕوخساری ئەوی چواندووە.

کەمالی دەڵێ [٤٨]:

**بـە بەغـدا دا ئەگـەر چـی ڕاحـەتی تەئمینـە ڕۆژو شـەو**

**لـە یوسف تەلعەتان خاڵی نییـە قـەت کـونجی ئـەحزانی ١٣٨**

کـەمالی دەڵـێ: ئێـستا وام لەبەغـدا، دڵنیـام لـەوەی حەوانــەوەی ڕۆژو شەومی تێدا مـسۆگەرە، بـەڵام ئەوانـەی بەسـیماو ڕوخـسار دەچـنەوە سـەر یووسف، هیـچ سووچ و قوژبنێکی پڕ لە غەم نییە خاڵی بن لەو کەسانە.

خادیم دەڵێ [٤٩]:

جەمالی ماهی کەنعانی لەحوسنی ڕوویی دولبەر بوو
کـەوا ئـەم شۆڕو غـەوغایە لـەنــاو کـەنعانیان پـەیـدا ٦٨

تەنیا جوانی ماهی کەنعانی (یووسف) لە قەشەنگی ڕوویی دلبەر بووە. هەر ئەویشە ئەم هەراو بینەو بەردەی لەناو کەنعانییەکان پیادە کردییە.

کانی دەڵێ[٥٠]:

لوقمــان ســیڕەت و صــورەتی وەك یوســفی میــسری
بــێ غـەل و غەشـە صـوورەت و ئـەخلاقی جـوانی! ٣٠

یـەکێك ناوبـانگی لوقمـانی هـەبێت، ڕوخـسار و شـکڵ و وێنـەی وەك یووسفی میسری بێ، دەبێ چ ناتەواوی و غەل و غەشێك لـەجوانی نیگـارو ڕەوشتی هەبێت.

قانیع دەڵێ [٥١]:

کـە حوسـنی یوسـفم بینـی، سـاعەتەن بـۆم موحەقـەق بـوو
(کــە عــشق از پــردە عـصـمـت بـیــرون ارد زلیـخــارا) ٥١

کـە جـوانی یووسـفم بینـی، ئـەو سـەعات و چـرکەیە گەیـشتمە ئـەو ڕاستییەی، کە عیشق و خۆشەویـستی ئـەو پەردەیـەی لـە نێـوان زولـەیخاو

هەڵەو خراپە یا (عیسمەت) هەبوو نەیهێڵێ . قانیعیش وەکو سالم هەمان شیعری حافزی تێهەڵکێشی شیعرەکەی کردووە، هەر یەکە لە گۆشە نیگای خۆیەوە تابلۆیەکی ڕەنگینی نەخشاندووە.

دیسان دەڵێ (٥٢):

ئەبێ یوسف گەلێ مەمنوونی قانوونی غەرامی بێ

کە ئایینەی جوانی ئەو، دڵی شۆخی زولەیخایە ٢٠٨

قانیع بە چاوێکی تر تەماشای مەسەلەکان دەکا. دەڵێ: یووسف دەبێ زۆر مەمنوونی یاسای عیشق و غەرام بێت، لەبەر ئەوەی ئاوێنەی جوانییەکەی ئەو دڵی شۆخ و نازدارێك بووە کە ئەویش زولەیخایە.

ویسالی دەڵێ (٥٣):

وەك شاهیدی کەنعان شەهی حوسن و جەمالی

ئەی شەهی زەمان پێم بڵێ دڵداری هەتا کەی؟ ٧٧

وەك شاهێدی کەنعانییەکان ئەتۆ پادشای جوان و شۆخ و شەنگەکانی، ئەی خاوەن شکۆی ئەو ڕۆژگارەم ئەو خۆشەویستی و دڵدارییە هەتا کەی؟

عاسی دەڵێ (٥٤):

ئەو دڵبەرە رەعنایە لە حوسنا کە بەبێ شك

سەد یووسفی میسری بەتەواوی لەکەمەردا ١٧

ئەو دلبەرە شۆخ قەدو قامەتە، کە هیچ گومان لەوەدا نییە و نابینرێ بە جوانی و قەشەنگی سەد یووسفی میسری وا لە کەمەردایە. بەواتایەکی تر جوانی سەد یووسف وا لەو دلبەرە کۆبۆتەوە.

- **بەشی دووەم**

**تەوەرەی یەکەم :**

**زیـنـدانـی کـردنـی یـووسـف و ئەوەی پێیەوە پەیوەستە**

**باباتاهیری هەمەدانی دەڵێ (٥٥):**

**برنــــدم همــــچو یوســـف گـــر بـــه زینـــــدان**
**ویــــا نالـــــم ز غـــــم چـــــون مـــــستـمـنـدان**
**اگـــــر صــــد باغـبــــان خـــــصمی نـــــماید**
**مـــدام ایـــم بـــه گـلـــزار تــــو خـنــــدان ١٨٣**

**بە لەهجەی کرمانجی خواروو (٥٦) :**

**وەکــــو یـوســـف ئـەگـــەر بـــخرێمە زینــــدان**
**بنـاڵێـــــنم وەیـــــا وەك مـوسـتـەمـەنـــــدان**
**ئـەگـــەر ســـەد باخـەوانیـــش دوژمـــنم بـــن**
**مــــا دامـــەکی دێمـــە باخـــت شـــادم، خەنـــدان ٥٩**

**ڕەنجووری دەڵێ (٥٧):**

**بـــە ئـــاه و ناڵـــەی (یـەعـقـــوب) کـــەنعان**
**بـــە حـوزن (یوسـف) نـــە قــەعر زینــدان ٥٩**

**ئـەم دێـرە بـاس لـە ئـاه و ناڵـەی یـەعقووبی کـەنعان دەکـا، لـە دووری کوڕی، باس لە غەمە زۆرەکانی یووسف دەکا لە بن و قووڵایی زینداندا.**

پەرتویێ هەکاری دەڵێ [٥٨]:

شـەبـــی یـــوسف ب خـــوە ب فـەئریت کـــەس
نبێ زیندانی و حـەدیپا بـەدو بوهتانـە عـوچ ١٣٩

شەوی یووسف بە خۆو بـەو جوانییـەی پـێش کەسێ کـەوت. لـە بـڕی قسەی ناشیرین و بوختان پێکردنی زیندانی کرا.

سالم دەڵێ [٥٩]:

عـــەزیزە وا لـــە نـــاو چـــاهە خـــوداوەندا نـــەجاتی دە
لـە چیهری ئەو بکا یەعقوب دڵی شێوەی صفا پەیـدا ١٩

خۆشەویـست و عـەزیزە کـەوا لـەناو چـاڵ و بیرەکەیـە، خـوای گـەورە ڕزگاری کەو با ئازاد بێ، لە ڕوخساری ئەو با دڵی یـەعقووب شـێوەی ڕوون و بێگەردی خۆی نیشان بدا.

مەلا وەسمان دەڵێ [٦٠]:

ئـەنیس و مـەحرەمی ئەســراری بـەزمی قودسـیان بـووی تـۆ
عـەجـەب ئێستە وەکـو یـوسف لـەنیو چاهی زەنەخدانی ٧٠

مەلا وەسمـان ڕووی لـە کەسـی دووەمـی تاکـەو دەڵـێ: تـۆ زۆر نزیـك و هـاودەم و هاوغـەمی ڕازەکـانی بـەزمی فریـشتە یـا پـاك و بـێ گونـاه و پیرۆزەکـان بـووی، بەسەرسـوڕمانەوە دەپرسـێ: عەجـەب ! ئێـستا وەکـو یووسف لەناو چاڵی یا ناو قۆرتی چەناگەی. ئیشارەتە بۆ زیندانی ئەو.

حاجی دەڵێ [٦١]:

**مەگەر بیستوویەتی خەططت لەنێو چاهی زەنەخدانت**
**ئـەسـیری یـووسـفـە بـۆیـە نـزولـی کـاروانـی بـوو ١٠٣**

**هـەبی نـەبی خـەتت گـوێی لـێ بـووە، کـە لـەنێو چـاڵی چـەناگەدای. کۆیلەی یووسفە بۆیە بەگەڵ کاروانەکان کەتییە.**

مەحوی دەڵێ [٦٣]:

**لـە دڵا بوونمـت ئـەر عـارە لـەلا، وا بکـە فـەرض:**
**مـاهی کـەنعانی یـو ئـەم موددە مـوقیمی چـاهی ٣٢١**

**ئەگەر پێت ناخۆشەو لات شوورەییە لەناو دڵی من دابی، ئارام بگرەو وای دابنێ ئەو ماوەیە لەناو چاڵ و بیر دای، وەك چۆن حەزرەتی یووسف ئارام و تەحەمووڵی هەبوو.**

وەفایی دەڵێ (٦٤):

**جـانی عـەزیزم بەسـەری زولفـی خـاو**
**یوسـفی دڵ چـی دی لـە زینـدان مەکـە ١٢٩**

**گیانـە، ئازیزەکـەم بـە سـەری زلفـی خـاوت، چـیتر کـۆت و زنجـیری دڵ مەکەو یووسف ئاسا فڕێی مەدە ناو زیندان.**

حەریق دەڵێ [٦٥]:

**تـۆ صاحـب ئـەم چـاە زنـەخدانـە بـی قوربـان**
**سـەد یوسـف کـەنعانی دەی بەیتـە زیـارەت ١٥**

ئــەو چــاڵی چــەنەگەیە کــە هەنــدێ کــەس هەیانــە زۆر جوانــەو بەتایبەتیش هی ئافرەت زیاتر. کە تۆ خاوەنی ئەو چاڵە جوانەی چەناگە بی بە قوربان (ئەوەندە لێت دێت)، سەد یووسفی کەنعان دەبێ بێنە زیارەتت بۆ تەماشاکردنی.

ئەدەب دەڵێ (٦٦):

**لەبەر حوسنی جیهانگیرت ، ئەسیری چاهی میحنەت بووم**

**عـەزیزم بـۆ زوڵەیخایـە ، کـە یـوسـف بـەنـدی زیـنـدانـە ٢١٠**

جوانی تۆ جیهانی داگیرکردووە، منیش بەندو ئەسیری چاڵی کۆست و دەردەسەری بووم، ئازیزم هەر بۆ زولەیخایە کە یووسف بەندی زیندانە.

زێوەر دەڵێ (٦٧):

**بـە حەپـسی یوسفی شـانی دڵـی عالـەم موکـەددەر بـوو**

**دڵی زیندان بە تالع بـۆ بـە دیداری مونەووەر بوو ٢٩٥**

زێوەر باس لەزینـدانی کردنـی یووسفی دووەم دەکا، کـە هـەموو دنیـا بەو هەواڵـە پەسـت و غـەمبار بـوون. ئـەو کـارە لـە بـەخت و شانـسی دڵـی زیندان بوو کە بەو بۆنەو دیدارە شەوق و ڕووناکی بەخۆوە بینی.

سابری دەڵێ (٦٨):

**بولبول و گـول شـەمع پـەروانە هـەموویان پێکەوەن**

**من وەکو یوسف بەتەنها حەپسی زیندان ئەی درێغ ١٠٨**

سابری دەڵێ: بولبول و گوڵ، شەمع و پەروانە پێکەوەن، شادن بێ غەمن. خۆی بە یووسف چواندووەو دەڵێ: بەداخەوە هەر من بەتەنیام و حەپسی زیندانم.

خادیم دەڵێ (٦٩):

**لە زیندانی دڵم سەبتە خەیاڵی نەقشە دەرناچێ**
**لە جورمی حوسنی بوو یوسف کە وەختێ کەوتە زیندانا ٩٤**

خەیاڵی ئەو، لە زیندانی دڵی جێگیر بووەو نەقشەکەی بەهیچ هێزێك دەرناچێ و ڕەش نابێتەوە. تاکە تاوانی یووسف کە ڕەوانی زیندانی کرد جوانییەکەی بوو.

شێخ نووری دەڵێ (٧٠):

**ئەگەر بەرزی مەسیحت بۆ نەبێ، تەقلیدی یووسف کە**
**نەگەییە ئاسمان ، هەوڵێ بدە زیندانی پەیدا کە ٣٧٢**

وێنەیەکی ڕەنگاو ڕەنگی زۆر جوان، شاعیر دەڵێ: ئەگەر بەرزی مەسیحت بۆ نەبوو (کە بەرزو بڵندییە)، لاسایی یووسف بکە لەناو چاڵ و بیرا ژیان بەسەر بەرە، ئەگەر نەگەیشتی بە ئاسمان، مەڕووخێ و کۆڵ مەدەو مەوەستەو کۆشش بکە بۆ ئەوەی زیندانێك بۆ خۆت پەیدا بکەیت.

پاکی دەڵێ (٧١):

**وەهەم بە تەقدیری تۆ بوو بیخەنە زیندان و چاه**
**یوسفی کوڕی یەعقوب ئەو کوڕی وانەوجەوان ١٨١**

بەتەقدیری باری تەعالا بوو یووسف خرایە زیندان و چالّ، کە تازە هەلّ یدەدا بۆ ئەوەی شتێك بەشت بکا.

– تەوەرەی دووەم:

**کوێرەبوونی حەزرەتی یەعقووب و چاکبوونەوەی چاوی**

جزیری دەلّێ [(٧٢)]:

**شوکور بیناهی یامن هاتو یەعقوب دیدە رەوشەن بوو**

**ب بویا یوسفی میصری ل کەنعانێ بەصەر پەیدا ٤٨**

سوپاس گەش و ڕووناکی چاوم، بەهاتنت دیدەکانم وەکو دیدەکانی یەعقووب ڕۆن و ڕەوشەن بوونەوە. یووسف لە میسر و یەعقووب لە کەنعان (فەلەستین)، بەبۆنی کراسەکەی بینایی بۆ چاوەکانی گەڕاوەو پەیدا بۆوە.

نالی دەلّێ [(٧٣)]:

**لە هیجری یووسفی میعراجی یەعقووبی فەلەك چاوی**

**نوجوومی بوو سپی هێشتا کو هەر حەیران و دامانە ١٥٨**

(هەروەك چۆن چاوی حەزرەتی یەعقووب لەبەر دووریی حەزرەتی یووسف کوێرایی داهات و سپیی بووەوە، ئاسمانیش لەبەر دوورکەوتنەوەی شەوی میعراج و نەمانی، کوێرایی داهات و چاوی سپی بوو، ئەوەتە ئەستێرەکانی سپین وەك چاوێ ئاوی سپیی داهاتبێ)[(٧٤)].

سالم دەڵێ (٧٥):

**بەشـوهرەت (سـالم)م ئـەمما لـە هیجـرەت پـیری کـەنعانم**
**دەبـێ ڕەوشـەن بەوەصلت دیـدەیی تـارم وەلـێ زەحمـەت (٥٢)**

بەناوبانگ من سالم، لەدووری خۆشەویستەکەم بوومەتە پیری کەنعان (یـەعقووب) بەدیـدارو گەیـشتن بـەتۆ چـاوە نابینـاو تاریکـەکانم گـەش و ڕۆشـەن دەبنـەوە، بـەڵام زۆر بەداخـەوە، ئـەو دیـدارە ڕوو نـاداو زۆر بەزەحمەتی دەزانم.

دیسان دەڵێ (٧٦):

**گەیانـدی بـۆم سـەبا بـۆی عطـری گێـسوو**
**وەکـو پیراهـەنی یـوسف بـە یـەعقوب [٤٤]**

وەك چۆن بـۆنی کراسـەکەی یووسـف چاوی یـەعقووبی گـەش و بینـا کـردەوە، ئـاوا بـای شـەماڵ بـۆنی گـوڵاوی خۆشـی پـرچ و کەزییـەکانی پێگەیاندم.

مەولەوی دەڵێ (٧٧):

**دەرگـای مـەدینەی حوسـن مـەحبووبـی**
**نـوور ئـەفزای دیـدەی جەرگـەی یـەعقووبی ٢٠٩**

دەرگـای شـارە جوانەکـەی خۆشەویـست و مـەحبووبم، هـەر تـۆی بـە بەزیادەوە ڕووناکایی بۆ چاوەکانی باوکت بگەڕێنێتەوە.

کوردی دەڵێ [(٧٨)]:

**کـوێر بـووە هـەر وەکـو یـەعقووب بـە خـودا دیـدە لـە بـۆت**
**سـا بنـێـرە وەکـو یـوسـف بـە شـیـفـای دیـدە لـە بـۆت٢٢**

کوردی سوێند بە خوای گەورە دەخواو دەڵێ: چاوەکانم لـە دووری تـۆ، وەکو چاوەکانی حـەزرەتی یـەعقووب کـوێرو نابینـا بوونـە. چـۆن یووسـف شیفای چاوی باوکی خـۆی نـارد، چـاوەڕێی تـۆم ئـەو دەرمانـەم بـۆ بنێـری (دیدار، نزیك بوونەوە، بۆن ).

مەحوی دەڵێ [(٧٩)]:

**یـەعقووب - وەش کـە (مـەحوی) یـە، چاوێـشەداری هیجـر**
**چـاوی بـە گـەردی ڕاهـی بـەشـیـرت گـلـی شـکـا ٢٢**

مەحوییە وەك حەزرەتی یەعقووب، چاوێشەی دوورییە. بە تۆزی گڵی ژێر پێی موژدەهێنەرەکە گلی چاوەکانی شکاند، دوای ئەوەی پێی گۆ ئـەوە یارو خۆشەویست بە ڕێوەیە.

حەریق دەڵێ [(٨٠)]:

**بـە بـۆی پـیـراهـەن یـوسـف نـەژادەن**
**پـیری و چـەم کـورانی کەعبـەی مـورادەن ٨٩**

سـەرەتا (کـورانی) نییـە لەنگـە (کـوران)ە، ئـەو شـیعرە کێـشەکەی خۆماڵییە واتە (پەنجە)یـە (٥ + ٥)ە. بـە بـۆنی کراسـەکەی یووسـف چـاوی

کـوێری یـەعقووبی پـیرو دڵ بـە غـەم چـاك بـووەوە. کـە ئـەوەش تاکـە مەبەست و هیوای بوو، وەك چۆن پیری چاو کوێرو نابینـا مـورادو ویـستی بە کەعبە گەیشتنە، چۆن یەعقووب بە یووسف. دوو شتی وەك یەکن.

سافی دەڵێ [٨١]:

لـە سـەد فەرسـەنگەوە بـۆ چـاوی نابینـا چـیا بەخـشە

هەزارانی وەکو یەعقووب لەبۆنی عەطری زولفانی ٢٤٥

کراسەکەی یووسف و بۆنـە خۆشـەکەی، تـوانی تـەنیا چـاوی نابینـای بـاوکی (حەزرەتی یەعقووب) چاك بکاتەوە. کەچی عـەزیزو خۆشەویـستەکەی ئـەو لـە دووری سەد قۆناغ و فەرسەخەوە، بەهەزارانی وەکو یـەعقووب، بـەبۆنی گـوڵاوە خۆشەکەی زلفەکانی، ڕووناکی بەچاوە نابیناکانی دەبەخشێتەوە.

سابری دەڵێ [٨٢]:

تـا بـەکـەی قوربـان بناڵێنم لــەنــاو (بیت الحزن)

بـۆنی جامەی تو نەهات بۆ نوری چاوان ئەی درێغ ١٠٨

بەقوربان تاکەی لەناو غەمخانەکەم هەر بناڵێنم، من بۆنی کراسەکەی تۆم گەرەکە، بەڵام بەداخەوە بۆ ڕووناهی چاوم نەهات!

ئەحمەد موختار دەڵێ [٨٣]:

وەعـدەی فـەرموو، کـە بێتـە کولبـەیی ئـەحزانی مـن

بـەڵکە ڕۆشن کـا دوو چـاوم یوسفی کەنعانی مـن ١٠٢

*بەڵێنی داوە، بێتە غەمخانەکەی من ئەوە یووسفی منەو چاوم پێیەوە ڕۆشن دەبێ.*

بێخود دەڵێ [٨٤]:

دەمێ بوو چاوەڕێی مژدەی قدوومی ئێوە بوو (بێخود)
خودا کردی نەسیمی پیرەهەن بۆ پیری کەنعان هات ١٥

بێخود دەڵێ: ماوەیەکە من چاوەڕێم، یەکێك مژدەی هاتنی ئێوەم پێ ڕابگەیەنێ. خودا کردی و چاوەڕوانییەکە دوایی هات، کزەبا فێنکەکە کە بۆنی کراسەکەی یووسفی بۆ پیری کەنعان (یەعقووب) هێنا.

کەمالی دەڵێ [٨٥]:

لە (میسر) بۆنی کراست بۆ هات
خۆ بیری کەنعان نزیکە لەلات ١٧٨

کەمالی دەڵێ: یەکێك لە حەزرەتی یەعقووبی پرسیوە، تۆ لە میسرەوە بۆنی کراسەکەی یووسفت بۆ هات، خۆ ئەو بیرەی یووسفیان خستبووە ناوی لە کەنعان بوو، لە میسر زۆر لەتۆ نزیکترە نەشتزانیوە. دیارە هەر بۆ خۆی وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە.

خادیم دەڵێ [٨٦]:

دیدە بێ بینا بوو وەك یەعقووب کە لەکولبەی حوزنەوە
بۆنی پیراهەن بەسەریا هات لەسەریا تەم نەما ٩٧

**دیدەکانی منیش وەکو هی یەعقووب لە غەمخانەکە تاریك و نابینا بوو، هەرهەندە بۆنی کراسەکەی بەسەر داهات، ئەم تەم و تاریکییەی لەسەرچاوەکانا هەبوو نەمان و ڕەوینەوە.**

**دیسان دەڵێ (٨٧):**

**چاوەکەم لەو کولبەیە بێ نوورە بێ تۆ چاوەکەم**
**چاوەڕێی بۆنی کراسی یوسفی کەنعانمە ٢٦**

**چاوەکەم لەم کۆلیتە و غەمخانەیە، چاوەکانم بەبێ تۆ بێ نوورو نابینان، حەزرەتی یەعقووب چاوەڕێی بۆنی کراسەکەی یووسیفە و من هی دیداری تۆ.**

شێخ نووری شێخ ساڵح دەڵێ **(٨٨):**

**لەو وەختەوە تۆ چوویتە سەفەر، کوێرە بینایيم**
**سا ڕەحمێ بە یەعقووبت کە، ئەی یووسفی ثانی ٣٨٤**

**لەو کاتەی ئەو سەفەری کردووە، چاوەکانی لە غەمی دووری نابینا و کوێر بوونە. خۆی بە یەعقووب چواندووە دەڵێ: سا ڕەحم و میهرەبانییەك بنوێنە ئەی یووسف بۆ گەڕاندنەوەی ڕۆنایی دیدەکانم.**

**سەفوەت دەڵێ (٨٩):**

**لە بۆنی ئەو کراسەی یۆسفی کەنعانە چاوانم**
**هەڵهێنا هەر وەکو یەعقووب ئەبینی ئێستە ڕووناکە ٧٧**

تـەنیا بـە بـۆنی کراسـەکەی یووسـفی کەنعانـە کـەوا چـاوەکانم وەکـو چـاوەکانی حـەزرەتی یـەعقووب ئاسـا هـەڵهێناو ئێـستا گـەش و بینایـە دیدەکانم.

ویساڵی دەڵێ (٩٠):

ئەگـەر بـادی صـەبا بـۆنی کراسـی وەسـڵی تــۆ بێنـێ
دوو چاوانم ئــەبێ بینـا وەکو یـەعقووبی کـەنعانی ٥٥

ئەگەر بێت و بای شەماڵ بۆنی کراسی (دیدارو پێك گەیـشتنمان)م بـۆ بینی. هەردوو چاوە کوێرەکانم وەکو چاوەکانی یـەعقووبی کـەنعانی چـاك و بینا دەبنەوە.

## ئەنجام

پاش خوێندنەوەو تاوتوێکردنی ئەم باسە، بەم ئەنجامانە دەگەین . وا لە چەند خاڵێك بەچڕی تۆماریان دەکەین:

١- شاعیرەکانمان وەکو دەرچووی حوجرە، کاریگەری قورئانی پیرۆزیان بەسەر بیرو بیرکردنەوەیاندا زاڵەو ڕەنگی داوەتەوە.

٢- ڕووداوەکانی نێو چیرۆکەکەو پاڵەوانەکەی (حەزرەتی یووسف) ئەوەندە کاریگەرن سەرنجی هەمووان و بەتایبەتی شاعیرەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە.

٣- شاعیرەکانمان توانیویانە ڕووداوەکانی نێو چیرۆکەکە وەکو هێماو ڕەمز بۆ مەبەستی تر بەکاربێنن.

٤- لەبەر پتەو و هێزی شێوازی چیرۆکەکەو گێڕانەوەکەی، وای لە شاعیرەکانمان کردووە کە بەدەیان وێنەو تابلۆی ڕەنگاو ڕەنگ لەو سەرچاوە گرنگە هەڵهێنجین.

٥- زۆربەی قۆناغ و وێستگەکانی ژیانی حەزرەتی یووسف بەوێنەی شیعری هونەری و جوان تۆمار کراون.

٦- جوانی لەڕادە بەدەری حەزرەتی یووسف و ئەو ستەم و غەدرو بێ وەفاییەی لێی کراوە، دوو جەمسەری خودی چیرۆك و وێنە هونەرییە شیعرییەکان پێك دەهێنن.

## پەراوێزەکان

١- دار المشرق، المنجد في اللغة والاعلام، بيروت، ١٩٧٣.

(٭) بۆ نووسینی ئەو کورتەیە ، سوود لەو سەرچاوانە وەرگیراوە:

ـ قورئانی پیرۆز.

ـ الامـام الحـافظ عمادالـدين ابـن كـثير، تفـسير القـرآن العظـيم، الطبعـة الاولى، دار نوبليس، بيروت، ٢٠٠٦، ص ٨٠ ـ ١٥٨ .

- عبدالوهاب النجار، قصص الانبياء، الطبعة الثالثة، دار الفكر، بيروت ـ بغداد، ص ١٢٠- ١٤٥.

– مەلا عبدالكريمی مدرس، تەفسیری نامی ، بەرگی چوارەم، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٢، ل ٢٩٦ – ٣٦٧.

(٢) صابری (دیوان)، چاپی یەکەم ، کۆکردنەوەی شێخ عبـدالرحمن شێخ نجـم الـدين صـابری، چاپخانەی شارەوانی کەرکوك، ١٩٦٩ .

(٭) ئـەو ژمارانـەی بەرامبـەر دێـڕە شـیعرەکان نووسـراون، هێمـاو ئیـشارەی لاپـەڕەی دیـوان و بلاوکراوەکانن.

(٣) بێخود (دیـوان)، کۆکردنـەوەو لەسـەر نووسـینی محمـدی مـەلا کـەریم، چـاپخانەی (سـلمان الاعظمی)، بەغدا، ١٩٧٠.

(٤) کـەمالی (دیـوان)، ئامـادەکردن و سـاغکردنەوەی کـەمالی عـەلی بـاپیر، دەزگـای ڕۆشـنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، (طبع دارالشؤون الثقافية العامة)، بەغدا ، ١٩٨٦.

(٭) دەقـە شـیعرەکانی نـاو ئـەو باسـە، وەکـو خۆیـان، چـۆن لـە سەرچـاوەکان هـاتوون وا تۆمـار کراون. بەهیچ شێوەیەك دەسکاری نەکراون.

(٥) کەمالی (دیوان)، ل ١٠٣.

(٦) سەلام (دیوان)، ئامادەکردن و پێداچوونەوەی ئومێـد کاکـە ڕەش، چـاپی دووەم، چـاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٩٠.

(٧) خادیم (دیوان) ئامادە کردن و ساغکردنـەوەی جـەمال محەمـەد محەمـەد ئـەمین، بەرگی یەکەم (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٠.

(٨) هەمان سەرچاوە، ل ٣٣٣.

(٩) قانع (دیوان)، بورهان قانیع کۆی کردۆتەوەو چاپی کردووە، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩.

(١٠) جزیری (دیوان)، هەژار شەرحی لێ کردووە، چاپی یەکەم، سروش، تەهران، ١٣٦١.

(١١) ڕەنجووری (دیوان)، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (آفاق عربیة)، بەغدا، ١٩٨٣.

(١٢) پەرتوییێ هەکاری (دیوان)، بەرهەڤکرن و تویژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی، دەزگەها رۆشەنبیری و بەلاڤکرنا کوردی، (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، ١٩٧٨.

(١٣) هەمان سەرچاوە، ل١٢٢.

(١٤) نالی (دیوان)، ئامادەکردنی دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی دووەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨.

(١٥) مەولەوی (دیوان)، لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، چاپخانەی (النجاح)، بەغدا، ١٩٦١.

(*) هەمان سەرچاوە، ل٤٧.

(١٦) مەلا وەسمان (دیوان) ، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەو لەسەر نووسینی دکتۆر امین موتابچی ، چاپخانەی (الآداب)، (النجف الاشرف)، ١٩٧٣.

(١٧) هەمان سەرچاوە، ل ١٢٨.

(١٨) مەحوی (دیوان)، لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، چاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفسێتی (حسام)، بەغدا، ١٩٨٤.

(١٩) حەریق (دیوان)، چاپی دووەم، چاپخانەی (الجمهوریة)، کەرکووك، ١٩٦٩.

(٢٠) تاهیربەگی جاف (دیوان)، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، ١٩٦٦.

(٢١) حەمدی (دیوان)، ساغکردنەوەو ڕێکخستن و چاپکردنی عەبدوڵڵا خدر مەولوود، چاپی سێیەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٢٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٤.

(٢٣) صافی (دیوان)، لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەی محمدی مەلا مصطفی هیرانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.

(٢٤) زێوەر (دیوان)، مەحموود زێوەر کۆی کردووتەوەو پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٢٥) هەمان سەرچاوە، ل ١٢٧.

(٢٦) صابری (دیوان)، ل١٤٩ .

(٢٧) بێخود(دیوان)، ل ٤٦.

(٢٨) هەمان سەرچاوە، ل ٨٩.

(٢٩) خادیم (دیوان)، ل ١٠١.

(٣٠) هەمان سەرچاوە، ل ١٥٥.

(٣١) سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، ١٩٨١، ل ٢٢.

(٣٢) شێخ نووری شێخ سالّح (دیوان)، ئازاد عەبدولواحید کۆی کردووتەوەو ساغی کردۆتەوەو لەسەری نووسیوە، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٣٣) سەفوەت (دیوان)، ئامادەکردنی د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، (دار الحریة للطباعة) بەغدا، ١٩٨٤.

(٣٤) جزیری (دیوان)، ل٥٠١.

(*) هەمان سەرچاوە، ل٥٠٢.

(٣٥) پەرتویێ هەکاری (دیوان)، ل١٣٢.

(٣٦) هەمان سەرچاوە، ل٢١٤.

(٣٧) نالی (دیوان)، ل١٧٠.

(٣٨) سالم (دیوان)، چاپی دووەم ، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٣.

(*) ڕێنووسەکەی ئەم نیوە دێڕە لە دیوانی حافز بەو شێوەیە تۆمار کراوە: (که عشق از پرده عصمت برون آرد زلیخارا).

- حافظ (حافظ نامه)، بهاء الدين خرمشاهى ، پخش دوم، چاپ دهم، شركت انتشارات علمى و فرهنگى، ١٣٧٥، ص ١٠٩.

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل٢٤.

(٤٠) مەولەوی (دیوان)، ل٥٢٥.

(٤١) مەلا وەسمان (دیوان)، ل١٩٢.

(٤٢) حاجی قادری کۆیی (دیوان)، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا، بەغدا، ١٩٨٦.

(٤٣) وەفایی (دیوان)، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.

(٤٤) ناری (دیوان)، کۆکردنەوەو ساغکردنەوەی کاکەی فەللاح، چاپخانەی کاکەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٨٤.

(٤٥) ناری (دیوان)، ل١٠٧.

(٤٦) حەمدی (دیوان)، ل٢١٦.

(٤٧) ئەحمەد موختار جاف (دیوان) ، ئامادەکردن و پێشەکی د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، چاپخانەی (الادیب)، بەغدا، ١٩٨٦.

(٤٨) کەمالی (دیوان)، ل١٣٨.

(٤٩) خادیم (دیوان)، ل٦٨

(٥٠) کانی (دیوان)، کۆکردنەوەی موەفەق ئەکرەم کانی، پێشەکی و لێکدانەوەی کەریم شارەزا، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٠.

(٥١) قانیع (دیوان)، ل٥١.

(٥٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٠٨.

(٥٣) ویصالی (دیوان)، ئامادەکردنی جەمال محەمەد محەمەد ئەمین، (دار الجاحظ للطباعة والنشر) بەغدا، ١٩٨٦ .

(٥٤) عاصی (دیوان)، ئامادەکردن و پێشەکی و فەرهەنگۆکی عەزیز گەردی، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٥٥) بابا تاهر (رباعيات)، تحقيق وتصحيح محمد حسن شيرازى ، انتشارات پيام محراب، تهران، ١٣٨٣.

(٥٦) بابا تايەرى هەمەدانى، گەنجينە بەشێكە لە چوارينەكان، دڵزار كردوويەتى بە سۆرانى، چاپى دووەم، سويد، ستۆكهۆڵم، ١٩٩٢.

(٥٧) ڕەنجوورى (ديوان)، ل٥٩.

(٥٨) پەرتوێى هەكارى (ديوان)، ل ١٣٩.

(٥٩) سالم (ديوان)، ل ١٩.

(٦٠) مەلا وەسمان (ديوان)، ل٧٠.

(٦١) حاجى قادرى كۆيى (ديوان)، ل ١٠٣.

(٦٢) ئەحمەدى كۆر - شێخ - (ديوان و شەرحى حاڵى)، عەزيز موحەممەد پور، چاپى يەكەم، چاپخانەى پەيام، ١٣٧٨ .

(٦٣) مەحوى (ديوان)، ل ٣٢١.

(٦٤) وەفايى (ديوان)، ل٦٣.

(٦٥) حەريق (ديوان) ، ل١٥.

(٦٦) ئەدەب (ديوان)، كۆكردنەوە، بەراورد، ساغكردنەوەو فەرهەنگ: محەمەد حەمە باقى، چاپى يەكەم، دەزگاى چاپ و بڵاو كردنەوەى ئاراس، چاپخانەى وەزارەتى پەروەردە هەولێر، ٢٠٠٥.

(٦٧) زێوەر (ديوان)، ل ٢٩٥.

(٦٨) صابرى (ديوان)، ل ١٠٨.

(٦٩) خاديم (ديوان)، ل ٩٤.

(٧٠) شێخ نوورى شێخ ساڵح (ديوان)، ل ٣٧٢.

(٧١) پاكى (ديوان)، ئامادەكردنى دكتۆر ابراهيم طاهر معروف، پێداچوونەوەى دكتۆر ابراهيم احمد شوان، نووسينگەى تەفسير، هەولێر، ٢٠٠٧.

(٧٢) جزيرى (ديوان)، ل ٤٨.

(٧٣) نالى (ديوان )، ل ١٥٨.

(٧٤) نـالی (دیـوان )، لێکۆڵینـەوەو لێکدانـەوەی مـەلا عبـدالکریمی مـدرس و فـاتح عبدالکریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

(٧٥) سالم (دیوان )، ل ٥٢.

(٧٦) هەمان سەرچاوە، ل ٤٤.

(٧٧) مەولەوی (دیوان)، ل ٢٠٩.

(٧٨) کوردی (دیوان)، چاپخانەی کوردستان، چاپی سێیەمین، هەولێر، ١٩٧٣.

(٧٩) مەحوی (دیوان)، ل ٢٢.

(٨٠) حەریق (دیوان)، ل ٨٩.

(٨١) صافی (دیوان)، ل ٢٤٥.

(٨٢) صابری (دیوان)، ل ١٠٨.

(٨٣) ئەحمەد موختار جاف (دیوان)، ل ١٠٢

(٨٤) بێخود(دیوان)، ل ١٥.

(٨٥) کەمالی (دیوان)، ل ١٧٨.

(٨٦) خادیم (دیوان)، ل ٩٧.

(٨٧) هەمان سەرچاوە، ل ٢٦.

(٨٨) شێخ نووری شێخساڵح (دیوان)، ل ٣٨٤.

(٨٩) سەفوەت (دیوان)، ل ٧٧.

(٩٠) ویصالی (دیوان)، ل ٥٥.

## سەرچاوەکان

- قورئانی پیرۆز.

**کتێبی کوردی:**

(١) ئەحمەد موختار جاف (دیوان)، ئامادەکردن و پێشەکی د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، چاپخانەی (الادیب)، بەغدا ١٩٨٦.

(٢) ئەحمەدی کۆر - شێخ - (دیوان و شەرحی حاڵی)، عەزیز موحەممەد پور، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیام، ١٣٧٨.

(٣) ئەدەب (دیوان)، کۆکردنەوە، بەراورد، ساغکردنەوەو فەرهەنگ: محەمەد حەمە باقی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە هەولێر، ٢٠٠٥.

(٤) بابا تایەری هەمەدانی، گەنجینە بەشێکە لە چوارینەکان، دڵزار کردوویەتی بە سۆرانی، چاپی دووەم، سوید، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢.

(٥) بێخود (دیوان)، کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی محمدی مەلا کەریم، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغدا، ١٩٧٠.

(٦) پاکی (دیوان)، ئامادەکردنی دکتۆر ابراهیم طاهر معروف، پێداچوونەوەی دکتۆر ابراهیم احمد شوان، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٧.

(٧) پەرتویێ هەکاری (دیوان)، بەرهەڤکرن و تویژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی، دەزگەها رۆشەنبیری و بەلاڤکرنا کوردی، (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، ١٩٧٨.

(٨) تاهیربەگی جاف (دیوان)، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، ١٩٦٦.

(٩) جزیری (دیوان)، هەژار شەرحی لێکردووە، چاپی یەکەم، سروش، تەهران، ١٣٦١.

(١٠) حاجی قادری کۆیی (دیوان) ، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم شارەزا، بەغدا، ١٩٨٦.

(١١) حەریق (دیوان)، چاپی دووەم، چاپخانەی (الجمهوریة)، کەرکووك، ١٩٦٩.

(١٢) حەمــدی (دیــوان)، ســاغکردنەوەو ڕێکخــستن و چــاپکردنی عەبــدوڵڵا خــدر مەولوود، چاپی سێیەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨.
(١٣) خادیم (دیوان) ئامادەکردن و ساغکردنەوەی جـەمال محەمـەد محەمـەد ئـەمین، بەرگی یەکەم (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٠.
(١٤) خادیم (دیوان) ئامادەکردن و ساغکردنـەوەی جـەمال محەمـەد محەمـەد ئـەمین، بەرگی دووەم (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨١.
(١٥) ڕەنجـووری (دیـوان)، لێکۆڵینــەوەی محەمــەد عــەلی قــەرەداغی، چــاپی یەکــەم، چاپخانەی (آفاق عربية)، بەغدا ، ١٩٨٣.
(١٦) زێـوەر (دیـوان)، مـەحموود زێـوەر کـۆی کردووتـەوەو پێـشەکی و پـەراوێزی بـۆ نووسیوە، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.
(١٧) سالم (دیوان)، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٣.
(١٨) ســەفوەت (دیــوان)، ئامــادەکردنی د. عیــزەدین مــستەفا ڕەســووڵ، (دار الحريــة للطباعة) بەغدا، ١٩٨٤.
(١٩) سەلام (دیوان)، ئامادەکردن و پێداچوونەوەی ئومێـد کاکـە ڕەش، چاپی دووەم، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٩٠.
(٢٠) شێخ نووری شێخ ساڵح (دیوان)، ئـازاد عەبدولواحیـد کـۆی کردووتـەوەو سـاغی کردۆتەوەو لەسەری نووسیوە، چـاپی دووەم، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنـەوەی ئـاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.
(٢١) صابری (دیوان)، چاپی یەکەم ، کۆکردنەوەی شێخ عبدالرحمن شێخ نجم الـدين صابری، چاپخانەی شارەوانی کەرکوك، ١٩٦٩ .
(٢٢) صـافی (دیـوان)، لێکۆڵینــەوەو ســاغکردنەوەی محمـدی مـەلا مـصطفی هیرانــی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
(٢٣) عاصــی (دیــوان)، ئامــادەکردن و پێــشەکی و فەرهــەنگۆکی عــەزیز گــەردی، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٢٤) قانيع (ديوان)، بورهان قانيع كۆی كردۆتەوەو چاپی كردووە، چاپخانەی زانكۆی سلێمانی، ١٩٧٩.

(٢٥) كـانی (دیـوان)، كۆكردنـەوەی موەفـەق ئـەكرەم كـانی، پێـشەكی و لێكدانـەوەی كەریم شارەزا، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٠.

(٢٦) كـەمالی (دیـوان)، ئامـادەكردن و سـاغكردنەوەی كـەمالی عـەلی بـاپیر، دەزگـای رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی، (طبع دارالشؤون الثقافیة العامة)، بەغدا، ١٩٨٦.

(٢٧) كوردی (دیوان)، چاپخانەی كوردستان ، چاپی سێیەمین، هەولێر، ١٩٧٣.

(٢٨) مـەحوی (دیـوان)، لێكدانـەوەو لێكۆڵینـەوەی مـەلا عبـدالكریمی مـدرس، چـاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفسێتی (حسام)، بەغدا، ١٩٨٤.

(٢٩) مــەلا عبــدالكریمی مــدرس، تەفــسیری نــامی، بــەرگی چــوارەم، (دار الحریــة للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٢ .

(٣٠) مەلا وەسمان (دیـوان)، لێكدانـەوەو لێكۆڵینـەوەو لەسـەر نووسـینی دكتـۆر امـین موتابچی، چاپخانەی (الآداب) ، (النجف الاشرف)، ١٩٧٣.

(٣١) مەولـەوی (دیـوان)، لێكۆڵینـەوەی مـەلا عەبدولكـەریمی مـودەڕیس، چـاپخانەی (النجاح)، بەغدا، ١٩٦١.

(٣٢) ناری (دیوان)، كۆكردنەوەو ساغكردنەوەی كاكەی فەللاح، چاپخانەی كاكەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٨٤.

(٣٣) نالی (دیوان)، ئامـادەكردنی دكتـۆر مـارف خەزنـەدار، چاپی دووەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٣٤) نــالی (دیـوان )، لێكۆڵینـەوەو لێكدانـەوەی مـەلا عبـدالكریمی مـدرس و فـاتح عبدالكریم، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٦.

(٣٥) وەفـایی (دیـوان) ، لێكۆڵینـەوەی محەمـەد عـەلی قـەرەداغی، چـاپخانەی كـۆڕی زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٨.

(٣٦) ویصالی (دیوان)، ئامادەكردنی جەمال محەمـەد محەمـەد ئـەمین، (دار الجاحظ للطباعة والنشر) بەغدا، ١٩٨٦.

**کتێبی عەرەبی:**

(١) الامـام الحـافظ عمادالـدين ابـن كـثير، تفـسير القـرآن العظـيم، الطبعـة الاولى، دار نوبليس، بيروت، ٢٠٠٦ .

(٢) دار المشرق ، المنجد في اللغة والاعلام، بيروت، ١٩٧٣.

(٣) عبدالوهاب النجار، قصص الانبياء، الطبعة الثالثة، دار الفكر، بيروت ـ بغداد.

**کتێبی فارسی:**

(١) بابـا تـاهر (رباعيـات)، تحقيـق وتـصحيح محمـد حـسن شـيرازى، انتـشارات پيـام محراب، تهران، ١٣٨٣.

(٢) حـافـظ (حـافـظ نامـه)، بهـاء الـدين خرمـشاهى، پخش دوم، چاپ دهـم، شـركت انتشارات علمى و فرهنگى، ١٣٧٥.

## ملخص البحث

# قصة النبي يوسف في نظر شعرائنا

**د. عبدالله خضر مولود**

جامعة صلاح الدين –أربيل/ كلية التربية / قسم اللغة الكردية


**هذا البحث الموسوم ب (قصة النبي يوسف "عليه السلام" في نظر شعرائنا). بحث تحليلي يدرس نماذج من أشعار اثنان و ثلاثون (٣٣) شاعراً من الشعراء الكلاسيكيين الكورد تتحدث الصور الفنية في هذه القصائد الشعرية وتبين المحطات والمراحل المتسلسلة لأحداث هذه القصة.**

**وإذا أمعننا النظر في الصور الشعرية لهذه الأبيات يتوضح لنا بأن للقرآن الكريم أثر بالغ في أحاسيس و عواطف شعرائنا، وله أهمية كبيرة في تطوير ثقافتهم و معلوماتهم كمصدر مهم، حيث وظف الشعراء هذه الأحداث في لوحاتهم الشعرية المتنوعة بأسلوب رمزي.**

**وترجع قوة هذه الصور الشعرية للأبيات وصحتها إلى مدى ثقافة ومعرفة شعرائنا وكيفية استخدامها.**

**آمل أن يكون هذا البحث المتواضع قد زاد لبنة في الأدب الكوردي القديم.**

ABSTRACT

## The story of prophet Josef in Our poets view

**Dr. Abdullah Khidir Mawlud**
College of Education for humanitarian sciences
Salahaddeen University-Erbil

This is an analytical study of the episode of Prophet Josef from the poets' perspectives. Samples of (33) classical Kurdish poets have been used ، where the poetic images and artistic portraits shed light on the phases and stages of the series of successive events in that episode.

When we look at the artistic images in the lines of the poems، it is obvious that Holly Quean has had a great effect on the feelings and emotions of our poets; moreover، this constitutes a significant part of their education and knowledge. Through using the events in a different way symbolizing the aspects targeted by the poets which consequently results in colorful poetic portraits.

The strength and delicacy of these images and styles of the lines and the poetic images belongs to the quality and quantity of the education and skillfulness of the poets.

# مەنەری
# مەدرەسە و فەرمانڕەوایی بێتووشی

**محەمەد عەلی قەرەداغی**
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی – هەولێر

**وتەیەکی کورت**

بە پشکنین و گەڕان بەناو دەستخەت و سەرچاوەکانی بەردەستمدا گەیشتوومەتە ئەوە کە لە بێتووشدا مەدرەسەیەك هەبووە سەرەتای بوونی دیار نییە و صەدان ساڵ بنکەی ڕۆشنبیریی و جێگەی زانای مەزن و پێگەیاندنی مەلا و فەقێیان بووە، تا ئەم ساڵانەی دوایش نەوەکانی ماموستایانی بێتووشی پشتاوپشت ئەو مەدرەسەیان ڕاگرتووە و ناوی چەندین زانای گەورەی بێتووشی لە پەڕاوێز و کۆتایی دەستخەتەکاندا هەیە، بەڵام مێژووی زۆریان نازانین.

هەروەها فەرمانڕەوایی یان میرنشینێك لە بێتووش و ناوچەی (ئالان)دا هەبووە، بەڵگەی پتر لە (١٥٠) ساڵ بوونی ئەم فەرمانڕەواییە، بە پەرتەوازەیی لەم لاو لا هەیە.

بەشی ئەوەندە لە بەڵگەنامە و زانیاریی لەبارەی (مەدرەسەی بێتووش) و (فەرمانڕەوایی بێتوش)ەوەم لە لا کۆبووەتەوە، بۆ ئەوە دەشێن بیاندەم بەگوێی مێژووی کورد و زانا و ناودارانی کورددا و بیانخەمە بەردەستی مێژوونووسانی کورد، بەڵکو لەمەولا شتێك بۆ مێژووی ئەم ناوچەیە بکرێت.

بابەتەکەیشم بەناوی "مەنەری مەدرەسە و فەرمانڕەوایی بێتووش"ەوە ناونا، ئەمەیشم ئاماژە بۆ ئەو پەندە کوردییە نووسی، کە دەفەرمووێ:

"قەلایش بڕمێ مەنەری دەمێنێ". چونکە بابەتەکەی من گەڕانە بەناو مەنەر = شوێنەواری حوجرە و کۆشك و تەلاری ئەو دوو شوێنە گەورەی ئەو ناوچەیە.

جگە لە سەرچاوە چاپەکان، بەشێکی زانیارییەکانم ڕاستەوخۆ لە دەستخەتەکان وەرگرتووە و بۆ ئەم بەشە ئاماژەم بۆ ژمارەی دەستخەتەکان کردووە، بۆ دەستخەتەکانی ئەو کتێبانەی بەغدا، کە پێشتر پێی دەگوترا (دار صدام للمخطوطات) دوایی (دار المخطوطات العراقیة) و دواتر (المركز الوطني للمخطوطات) نیشانەی (م. و)م داناوە. بۆ ئەوقافی سلێمانی هەندێ جار ناویم نووسیوە و ئەگەر جار جاریش نووسیبێتم (سلم) ئەوە هەر مەبەستم کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانییە. بۆ کتێبخانەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵیش (خ)م داناوە. ئەگەر (ع)شم دانابێ مەبەستم ئەم دەستخەتانەیە، کە لە لای مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف بوون و سوودم لێ وەرگرتوون.

## مەنەری مەدرەسەی بێتووش

### کتێبخانەی بێتووش

**کە مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێتووشی وتوویەتی:**

**لەلای قازی سەردەشت (٣٠٠) سێسەد دەستخەتی کۆنی دیوە.**

هەموویان مۆری کتێبخانەی بێتووشیان پێوە بووە، دوور نەڕۆیشتووە و[1]، لەوانەیە دەستخەتەمکانی ئەو کتێبانە گەلێ لەو ژمارەیەش زیاتر بووبن؛ چونکە ئەو مەدرەسەیە مەدرەسەیەکی بەتەمەن و فرە مەلا و فرە فەقێ بووە، پشتاوپشت کوڕی ئەو بنەماڵە - وەك بنەماڵە زانیارییەکانی دیکەی کوردستان - زانیاریی و کتێب و دەستخەتی لەباو و

باپیریەوە بەمیرات بۆ ماوەتەوە، کام باو و باپیر؟ ئەوانـەی بـە هەرلایەکـدا چووبن کاتێك گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان دیاریی دەستیان دەسـتخەت و کتێـب بـووە، هـەر کاتێـك فەقێیـەك ویـستبێتی کـارێکی بەبایـەخ بـۆ مامۆستایەکی بێتووشی بکات، مامۆستا داوای ئەوەی لێ کـردووە کتێبێکـی باشی بەخەتێکی جوان بۆ بنووسێتەوە.

مامۆسـتا مـەلا مـەحموودی بـرا گـەورەی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵای بێتووشـی کاتێـك ماوەیـەك لـە (الاحـساء)ی سـعوودییە بـووە، دوایـی گەڕاوەتـەوە کوردسـتان، چـی لەگـەڵ خۆیـدا هێناوەتـەوە؟ وەڵامـی ئـەم پرسیارە ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە مامۆستا مەلا مـەحموودی بێتووشـی لەو دوورە وڵاتەوە و، بەو ڕێگە سەخت و سامناك و دوور و درێژەدا، جگـە لە دەستخەت کە لەوێ بـە کـڕین یـان بـە دیـاریی، یـا بـە بـۆ نووسـینەوەی قوتابیانی خۆی بۆی ـ یان ڕێگەگەلی دیکە، یادگار و شوێنەوارێکی ئەوتۆی دیار نییە لەتەك خۆیدا هێنابێتیەوە.

بەهۆی پەرتەوازە بـوون و تێداچـوونی کتێبخانـەی بێتووشـەوە، نـازانین کتێبخانـەی بێتـووش چـی تێـدا بـووە و مامۆسـتا مـەلا مـەحموودیش لـە (الاحـساء)ەوە چـی لەتـەك خۆیـدا هێناوەتـەوە، بـەڵام بەڵگـەی ئـەوەمان لەدەستدایە، کە مامۆستا مەلا مـەحموود لـە (مـبرز)ی سـەر بـە (الاحـساء) جێگەی ڕێزی فەقێ و قوتابیانی بووە و بەشانازییەوە کتێبی گەورەیان بۆ نووسیوەتەوە یەك دوو نموونەی ئەم لایەنەمان لەدەستدایە:

یەکـەمیان: شـەرحی شـەمائیلی تـرمـذیـی دانـراوی مـەناوی. کـە لـە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانیدا لەنگەری گرتووە، کـە فەقێیـەکی لە (الاحساء)ی سعوودیە بۆی نووسیوەتەوە و لە کۆتاییەوە نووسیویە:

"ووافق الفراغ من نسخ هذا الكتاب المسمى بالشمائل، شملنا الله تعالى بالخيرات في الغدو والاصايل آمين. وقت العصر يوم الجمعة وهو اليوم العشرون في شهر رمضان، احد شهور سنة ١١٨٥هـ خمس وثمانين بعد المائة والالف هجرية نبوية، على مهاجرها أفضل الصلاة وأزكى التحية، وذلك بقلم الفقير الحقير المقرّ بالذنب والتقصير، راجي عفو ربه المنان، دخيل الله به سليمان بن هريس، الإحسائي مولدا ومسكنا، برسم الأجل الاسعد الارشد الشيخ محمود بن محمد، جعلني الله وإياه ممن عمل بسنة نبيه صلى الله عليه وسلم ـ في الحياة، وأماته عليها عند الوفاة آمين. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين.

ئەم دەستخەتە کتێبێکی گەورەی نایابە نزیکی (٦٠٠) لاپەڕەیە.

لە کتێبخانەی ناوبراو ژمارە (٢٥١)ی دراوەتێ.

دووەمیان: بەڵگەیەکی گەورەی پەرتەوازەبوونی دەستخەتەکانی کتێبخانەی مامۆستایانی بێتووشە، یەك پەڕەی کۆتایی کتێبێکی تەفسیرە بەناوی حاشیەی (سعدی الرومی)، دیارە ئەمیش کتێبێکی گەورە بووە، بەداخەوە ئێمە تەنها یەك لاپەڕەیمان لەدەستدایە، کە ئەمیش بەخەتی هەمان نووسەرەوەیە و تیایدا هاتووە:

"وقع الاختتام المهيمن العلام، يوم الأربعاء خامس جمادي الأول، المنخرط في سلك شهور سنة أربع وأربعين وتسعماية. كملت حواشي العلامة، محقق الروم، سعدي أفندي ـ قدس الله سره ـ صبح يوم الجمعة، الخامس والعشرون في شهر ذي الحجة الحرام، أحد شهور سنة ١١٨٦ ست وثمانين ومئة وألف، من هجرته ـ صلى الله عليه وسلم ـ كتبها العبد الفقير الى مولاه، الغني به عمن سواه، راجي عفو ربه الكريم المنان، دخيل الله بن سليمان بن هريس،

الإحسائي عفى الله عنهم بمنه وكرمه، إنه جواد كريم. وكان نسخها بمدينة المبرز من الإحساء المحروسة، جعلها الله دار أمان، بحرمة من أنزل عليه القرآن، وذلك بامتثال الأسعد الارشد الموفق لكل خير من الملك المعبود، الشيخ محمود، فسح الله تعالى في مدة حياته، بحرمة القرآن العظيم وآياته آمين. والحمد لله وحده وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما".

ئەم دوو نموونەم هێنایەوە تا لە دەرگای ئەمانەوە بچمە ناو باسی کتێبخانەی بێتووش، کە سووچێکی هەوڵ و بەسەرهاتی ساماناکیم لەم ڕۆژانەدا بیست، ئەم هەواڵە کە هەر چۆن لێی وردبینەوە و سەرنجی بدەین، داخ و پەژارەمان زیاد دەبێت و دەبێ هەر بەو دەردەوە دەست بەدەستدا بدەین، بەخوێنی دڵی لەچاوەوە سەرکردوو، بۆ بەری ڕەنجی سەدان ساڵەی دەیان زانای گەورەی گەلەکەمان بگرین، کە کەمتەرخەمیکردنی ئێمە لە عاستیاندا بە دەردێکی بردوون، مرۆڤی خاوەن ویژدان و هەست ناتوانێ گوێ لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیان بگرێت!

با پێکەوە ئەو بەسەرهاتە خەمئاوەر و جەرگبڕانە بخوێنینەوە، کە بێگومان دەیان و دەیان کارەساتی لەو بابەتە هەن، دەکرێ کۆ بکرێنەوە، ناوی "ڕەنجسووتاویی مامۆستایانی دێرینی کوردی" یان لێ بنرێت.

برای خۆشەویستم مامۆستا عوسمانی موفەتیش لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی سلێمانی دەورێکی باشی هەیە لە دۆزینەوە و کۆکردنەوەی دەستخەت و شوێنەواری مامۆستایانی کورد، تا ئێستا گەلێ شوێنەواری لە ئاوارە چوون و ئاودیوبوون ڕزگار کردووە و بەهۆی ئەوەوە گەیشتوونەتە

شـوێنانێك، ئـۆقرەی تیـا بگـرن و مەترسـیی لەناوچـوونیان و هەڕەشـەی دەستێوەردانیان کەمتربێ.

مامۆستا عوسمـان ـ مـاڵی ئاوابێـت ـ لـە دڵسۆزیی خۆیـەوە و لـەوەوە، کـە گومانی دڵسۆزیی بەشوێنەواری مامۆستایانی کورد بەمن دەبات، هەرچەند شوێنەوارگەلێ دەست بخـات پـێش ئـەوەی هیـچیان دەربـارە بکـات، یـان بـۆ شـوێنێکیان بـەرێت، تێکڕایـان پێـشانی مـن دەدات، منـیش بـۆ کـاری خـۆم سـوودیان لـێ وەردەگـرم و لـە نووسنەکانیـشدا دەربارەیـان نـاوی مامۆسـتا عوسمان وەك سەرچاوەی سەرەکی باسەکە دێنم.

لەم ماوەیەدا هەواڵی ئەوەی پێدام، کە چەند دەستخەتێکی دەستخستووە و مـاڵی ئاوابێـت ـ وەك پێـشتر وای کـردووە ـ دەسـتخەتەکانی بـۆ هێنـام، دەسـتخەتەکان نیـشانەی گـەورەیی کتێبخانەیـەکیان پێـوە دیـاربوو، کـە ئەمانە پاشماوەی ئەو کتێبانەیە بـن. لـەکاتی پرسـیار و گێڕانـەوەی باسـی دەستخـستنی شـوێنەوارەکاندا مامۆسـتا عوسمـان یـەك دوو قـسەی جێگـەی سەرنـج و مایەی داخیشی لە هەمان کاتدا کرد.

یـەکێك لـەو قـسانە ئـەوە بـوو: ئـەم دەسـتخەتانەی لەشـوێنێك لـە دەوروبەری سەردەشت دەستکەوتووە، خاوەنی دەستخەتەکان پێی گوتـووە: ئەمە پاشماوەی دەستخەتگەلێکی زۆرن، کە کابرایەکی فارس هاتووە بەشی چاك و زۆربایی بردووە!

قـسەی دووەمـی ئـەوەبوو: خـاوەنی دەسـتخەتەکان ئـەم دەسـتخەتانەی ترنجاندووەتە ناو کەنوە تەنەکەیەك و سەرەکەی لـەحیم کـردووە، کـە لـە تەك مامۆستا عوسمـان ڕێکـەوتوون دەسـتخەتەکانی بـداتێ، مـاوەی ئـەوەی نەداوە سەری تەنـەکەکە هەڵتەکێنێ و بەتەواوی دەمەکەی بکاتـەوە، تـەنها

بەشێکی کەمی کەنوەکەی شکاندووە و ئەو دەستخەتە نایابانەی پەڕە پەڕە دەرکێشاوەتە دەرەوە، واتە ئەو هەموو کتێبە گەورە و نایابەی هەڵوەشاندووە و! شیرازەیان پساندووە و پەرپووت و شپرزەی کردوون! بۆیە کە هێنانی بۆ لای من و باسەکەی بۆ گێڕامەوە بە کوڵی دڵ بۆ ئەم کارەساتە گەورە و سامناکە گریام، کە بەسەر ئەم کتێبانە هاتووە!

دەبێ ئەم کتێبخانەیە هی کێ بووبێت؟

ناتوانین بڵێین ئەم کتێبانە تەنها کتێبخانەی یەك زانا، یان تەنها ماموٚستا مەلا مەحموود بووە، بەڵکو دەکرێ بڵێین: ئەم کتێبخانەیە تا سەردەمی تێداچوونی، خەرمانی بەپێز و بەرەکەتی ئەو بنەماڵە بووە و، هەرکەس لە عاستی خۆیەوە شارای گەورەی خستۆتە سەر و تەمەنێکی پان و بەرینی بووە، زانایانی ئەوەندە زۆر بوون لە ژمارە نایەن، ڕەنگە نەتوانین تەنا ناوەکانیشیان تۆمار بکەین. ئەوەتا لەشوێنێکدا ماموٚستا مەلا عەبدوڵڵای سێیەم ناوی زنجیرەیەکی خۆیان دەنووسێ ڕشتەکەیان دەگاتە نۆ کەس، کە لە ناوەکانیانەوە دیارە هەموویان زانا و خوێندەوار بوون و زۆر نزیکە باو باپیرانی پێشووتریشیان، کە ئەم ناوی نەهێناون هەموویان ـ وەك ئەمان ـ مەلا و مەلاچاك بووبن.

لەباسی کتێبخانەی بێتووشدا گەلێ شتی شاراوە و باسی نەزانراو هەیە، لەوانەیە هەندێکیان هەر نەزانرێن، هەندێکیشیان دەکرێ بە بەڵگە و خوێندنەوەی پەراوێز و پارچە پارچە کاغەزی ئەملا و ئەولا سەرە دەزووی بۆ بدۆزرێتەوە و هەندێ ئەنجامی باشی بۆ بەدەست بێت.

لەپەنای یەکێك لە دەستخەتەکانی ماموٚستا مەلا مەحموددا دوو دێر هەیە هەندێك شت دەدەن بەدەستەوە و گەلێ پرسیاری نوێیش قوت دەکەنەوە. با لەپێشدا دوو دێرەکە بخوێنینەوە:

"من بعض الكتب التي أخذت من الفقير الى الله احمد بن شيخ محمود الكردي، اخذت منه في دجلة. واخاذها طائفة الخزاعل، جعلهم الله كالظل الزائل! ثم استردها المكرّم محمود پاشا، رزقه فعل الخيرات".

واته: ئەم دەستخەتە لە هەندێك لەو دەستخەتانەیە، کە هۆزی خەزاعیل ـ خوا بیانکا بە سێبەری لاچوو (بڵقی سەرئاو) ـ لە بێچارە ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحمودیان سەند لە چۆمی دیجلەدا، دوایی بەڕێز مەحمود پاشا (دیارە بابانە) بۆی سەندمەوە، خودا بیخاتە سەر ڕێگەی کاری چاك.

یەکەم: ئەم کارەساتە کەی ڕوویداوە؟ من ـ بەگومانەوە ـ دەڵێم: دوور نییە کاتێ مامۆستا مەلا مەحمود لە ئیحساء گەڕاوەتەوە بە تەمای ئەوە نەبووە ئیتر نەگەڕێتەوە بۆ ئیحساء، بۆیە بە سەڵتیی هاتووەتەوە و کتێب و ماڵ و هەرچی هەبووە، لەوێی بەجێهێشتووە، دوایی کە دەستبەرداری گەڕانەوەی ئیحساء بووە کتێبەکانی لەوێ ماونەتەوە و هێنانەوەی کتێبخانەیەکیش لەو سەردەمەدا ـ لەهەر حەجم و قەوارەیەکدا بووبێت ـ لەئیحسائەوە بۆ بێتووش کارێکی ئاسان نەبووە.

ئەمە لە لایەکەوە، لەو لایشەوە کە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای برای مامۆستا مەلا مەحمود گەڕاوەتەوە بۆ ئیحساء، بێگومان سەرپەرشتی و پاراستنی ئەو کتێبانەی گرتووەتە ئەستۆی خۆی. من وای بۆ دەچم ئەو شتانە هەروا مابنەوە، تا مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا لەوێ لە ئاوارەییدا کۆچی دوایی کردووە، دوای ئەوەی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی مامۆستا مەلا مەحمود چووبێت بەسەردەمی ماڵ و شوێنەواری مامی و کتێبخانەکەی باوکیەوە، کە لەوێ بەجێماوە، ئەمەیش لە سەردەمی فەرمانڕەوایی مەحمود پاشای بابان ـ هەر کام جاری فەرمانڕەوایی

دابووبێـت و دا بـووە، کـە دەکەوێتـە دوای کۆچـی دوایـی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵای بێتووشـیەوە. بەڵگـەی پتـەوکردنی ئـەم بۆچـوونەیش لـەوەدا دەبینم، کە دەستخەتەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ـ کـە دیـارە تـا کۆتـایی ژیانی لە دەستی خۆیدا بوون ـ لەکوردستاندا بوون و بەزۆری لە بێتوش و دواتریش لە سلێمانی پارێزراون.

دووەم: مامۆسـتا مـەلا ئەحمـەد لـە نووسـینەکەیدا دەڵێـت: ئەمـە لـە هەنـدێك لـەو دەسـتخەتانەیە (کتێبانـەیـە)، گومـان بـۆ ئـەوە دەچێت ئـەو کتێبانـەی لـە مامۆسـتا مـەلا ئەحمـەد زەوت کـراون زۆر بـووبن، دیـارە ماوەیەکیشی بەسەردا تێپەڕیوە تا مامۆستا مـەلا ئەحمـەد گەڕاوەتـەوە بـۆ کوردسـتان، پـەنای بردۆتـە بـەر مـەحمود پاشـا و ئـەویش کـاری بـۆ دەستخستنەوەی کتێبەکان کردووە ، لەوانەیە لەو ماوەدا زۆر لـەو کتێبانـە تێداچووبن.

هـەروەها لـەم بنەماڵـەدا ـ وەك لەمـەولا نـاوی چـەند زاتێکیـان دەبـەین چەند قازی و موفتییان تێدا هەڵکەوتووە، ئەمانـەیش بـەزۆری وەك چـۆن بینیمـان مامۆسـتا مـەلا مـەحمود لـەو ڕێگـە دوور و درێـژەی سعوودیەوە دەسـتخەتی گەیانـدبووە بێتـووش، - بێگومـان - لـە هەرلایـەك بـووبن و هاتبنـەوە، هیوایـان کۆکردنـەوەی کتێـب و دەوڵەمەنـد کردنـی خـەرمانی (کتێبخانـەی بێتـووش) بـووە. دیـارە ئـەم کتێبخانەیـە ماوەیـەکی دوور و درێژ لە گەشەکردندا بووە، تا ـ نازانین کەی بـووە ـ وردە وردە کەوتووەتـە کزبوون، ئیتر ئەستێرەی ئـاوا بـووە و کەوتووەتـە بـەر چـەپۆکی زەمانـە و ئەو کارەساتەی بەسەر هاتووە کـە نـاتوانین بگـەین بـە سووچێکی هەواڵـە سامناکەکەیدا.

ئەوەنــدەی مــن لێــرەدا پێمــدەکرێت و، لەدەســتم دێــت بیکــەم ئەوەیــە هــەواڵی تێداچــوونی ئــەم کتێبخانەیــە و، لەناوچــوونی دەســتخەتەکانی و، پەرتــەوازە بــوونی بەشــێکی بــۆ هەنــدەران و ئــەملا و لاو، لەدەســتدابوونی نیشانە و شوێنەواری ئەم کارەساتە تۆمـار بکـەم و، لەپـەنای ئـەو پاشـماوە کەمەیــشەوە کــە توانیومــە ببیــنم نــاو و ســەردەمی ژیــان و شــوێنەواری چـەند کەسـێك لـەو مامۆسـتایانە بخەمـە ڕوو، بـەڵکو لەمـەولاش شـتگەلی دیکە بدۆزرێنەوە و بەسەرهات و هەواڵی زیاتر بزانین.

بەو پێیەی بە پێی تەمەن ئێمە هەواڵی دەزانین مامۆستا مەلا مەحموود یەکــەم پیــاوی ئــەم بنەماڵەیــە کــە شــتێك لــەژیانی و شــوێنەواریم دەستخستووە. بۆیە لەژیانی ئەم مامۆستا بەڕێزەوە دەست پێدەکەم.

**مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی:**

پــێش ئــەم نووســینە کورتــە و نووســینەکانی دیــشم، داوای لێبــوردن لــە خوێنەری ئازیزم دەکەم دەربـارەی دووپاتکردنـەوەی هەنـدێك مەبەسـت و باس کە بەبیرخستنەوەی پێویستیان دەزانم بۆ گـەلێ کـات و جێگـە. لێـرە یەکێك لەو بیرخـستنەوانە دێتـە پـێش و، بـێ ئـەوە باسـەکە تـام و چـێژی نابێت.

گەلێ جار نووسیومە: بەختەوەرترین مامۆسـتای کـورد لـەڕووی ئـەوەوە لەجیهاندا ناسرابێت و ناوی کەوتبێتە ناو ناوان، ئەو مامۆستایە بـووە کـە بۆی هەڵکەوتبێت لە کوردستان دەرچووبێت و گەیشتبێتە یەکێك لە شارە گەورە یان دیارەکانی جیهان، ئیتر ئەوە بەس بووە بۆ ئـەو مامۆسـتایە کـە ناوی دەربکەوێت و جێگەی خۆی بگرێت و، مایەی سوود گەیاندنیش بێت بە دەوروبەری و جێگـای دوورتـریش لـە وڵاتـانی جیهـان و، دوای خۆیـشی

نـاوی زینـده و دیـار لـه ریـزی مامۆسـتا ناودارەکـانی گـەلانی دنیـادا بپارێزرێـت. ئەمـە چـەندە بـۆ مامۆسـتایان ڕاسـت و دروسـتە ئەوەنـدە و زیـاتریش بـۆ دانـراو و شـوێنەواری مامۆسـتایانمان ڕەواو شـیاوی گـوتن و نووسینە.

مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی برای مامۆستای زانا و ناوداری کورد مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشییە. وەك دەگێڕنەوە پلەی مامۆستا مەلا مەحموود لە پلـەی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵلا کـەمتر نـەبووە ئەگـەر زیـاتر نەبووبێت.

یەکێك لەو باسانەی دەماودەم دەگێڕدرێتەوە دەربارەی بلیمەتیی هـەردووکیان، ئەوەیە، کە جووتە برا پێکەوە ڕێگەی (بەصرە و ئیحساء لە وڵاتـی عەرەبـستانی سعوودیی دەگرنـە بـەر، لەڕێگـەدا پارەیـان لـێ دەبڕێـت و خـەرجی ڕێگـەیان پـێ نـامێنێ، چـەند کتێبێکیـان پـێ دەبێـت، لەوانـە (توحفـە و قـامووس)، دەڵێـت: مامۆستا مەلا عەبدوڵلا قامووسەکە لەبەر دەکات و مامۆسـتا مـەلا مـەحمودیش توحفەکـە و، دوایـی دەیانفرۆشـن و بـە پارەکـەی سـەفەرەکە دەکـەن[٢]. هـەر لەمەیشەوە بووە، کە هەردووکیان لـە (ئیحساء) بـوون، مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵلا مەتەڵێکی فیقهی دروست کـردووە و، ناردوویـەتی بـۆ مامۆسـتا مـەلا مـەحمود و داوای وەڵامی لێ کردووە مەتەڵەکەیش بەم شێوەیە:

"ومما وقع لي ـ وأنا الفقير الى الله عبدالله ـ مع شيخي وأخي الشيخ محمود سنة ١١٧٧هـ في هجرالبحرين، انني عملت بيتـا وأرسـلته اليـه أسـأله. اعرابـه، وصورتـه:

كم مصل صائم من غير ذوق رام وصلا
قلت لما قال لي: هل كل من صام وصلاً

بينوا لنا ـ ادمكم الله للتبيين، ويبلغكم الى ذروة سنام اليقين ـ مقول (قلت) المذكور في البيت، وقاكم الله قول ليت، ولا افجعكم بنعي ميث، وأقنعنا الله واياكم بالعصر والزيت. فوافق وصول السؤال اليه، والقاء الرسول الألوكة عليه، وقت اشغاله بالتدريس، وإفادة الناس بالعلم النفيس، فبعد ان نظر سويعة ـ في تلك الرقيعة، كتب إليّ فيها كالمنصفين، لا المجادلين المتعسفين: (مقول قلت لا أعرفه في هذا الحين، وعسى الله أن يأتي باليقين) فلما بلغني شريف جوابه، وفهمت فحوى خطابه، رددت إليه ماكتبه التذاذا بالخطاب الواقع، بعد أن أعربت قوله: (إعرفه)الذي هو مضارع، إعراب فعل الأمر، ففهم بتلك الاشارة الخفية حقيقة الأمر، واتضح أنّ (لا) التي في عجز البيت هي مقول القول، وسلمت المسألة من العول، بحول من له القوة والطول، وحمل ذلك الاعراب على غاية الاغراب، وأغراه مغرى العجب، بالاستنان في سنن الطرب.."[٣].

ئەم دەقەم وەك خۆی نووسیی تا بە وەرگێڕان تام و چێژەكەی نەبزرکێت، مامۆستایان كامی بكەن. لەم دەقەوە چەند شتێك وەردەگیرێ:

یەكەم: مامۆستا مەلا مەحمود براگەورەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا بووە.

دووەم: وەك مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا و شان بەشانی ئەو لە (ئیحساء) مەدرەسەی هەبووە و جێگەی ڕێز بووە.

سێیەم: مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا پێی دەڵێت: شێخم و مامۆستام.

چوارەم: مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا نزیكی پێنج ساڵ لە (ئیحساء) ماوەتەوە.

جا ئەم مامۆستایە، كە خاوەنی ئەم هەمموو پلە و ڕێز و زانیارییە بووە و دیویەتی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای برا بچووكی ئەو هەمموو كتێب و

شیعر و ئەدەبەی هەبووە.. دەبێ ئەمیش هەستی نەبزوابێت لاسایی برا بچووکی خۆی بکاتەوە؟ گومان نابرێت. بە تایبەتیی کە - وەك لەمەولا باسی دەکەین - دانراویشی بووبێت. ئەی هۆی چییە ئەم مامۆستایە وا نەناسراو و بێ ناونیشان سەری ناوەتەوە؟ دیارە هەر ئەو دەردەیە، کە باسی دەکەین و هەموو جارێ دەیلێینەوە، لە کوردستاندا مانەوەی و بایەخنەدانی ڕۆشنبیرانی کورد بە مامۆستا و زانایانی خۆمان ئەمیشی بردۆوەتە ڕیزی ئەو هەموو زانایەی، کە ناو و شوێنەواریان کوێر بووەتەوە!

خۆشبەختانە دوو نامیلکەی بچکۆڵەی ئەم مامۆستایەم دۆزیوەتەوە، کە لە هیچ شوێنێکدا ناویان نەهاتووە و کەس باسی نەکردوون، لێرەدا لەڕێگەی ئەم دوو نامیلکەیەوە، ناوی ئەمیش ئەخەینە ناو ناوی زانایان و لە مێژووی ژیانیاندا جێگەی - با شیاویشی نەبێت - بۆ دادەنێین.

ئەم دوو نامیلکەیە لەتەك دانراوی دیکەی مامۆستایانماندا گەیشتوونەتە (م. و)و لەوێ لەنگەریان گرتووە.

یەکەمیان: نامیلکەیەکە لە زانیاری (نەحو)دا، جیاوازی نێوان (فعل) و (اسم فاعل) دەردەخات، نامیلکەکە دوو لاپەڕەیە. سەرەتاکەی ئاوایە:

"هذا فرق بین اسم الفاعل والفعل. من كلام الفاضل العالم البیتوشي ملا محمود رحمه الله. بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله رب العالمين. الصلاة والسلام على سيد الأولين والآخرين. وعلى آله وأصحابه المتأدبين.

اما بعد: فأقول: اعلم ان الفرق بين اسم الفاعل والفعل حيث قالوا..."

کۆتاییەکەی:

"... وبسبب عدم مشابهة الفعل بالمفرد المذكور صار الفعل مع ماهو مغاير له جملة لا مفردا، هذا الفرق بينهما استعمالي لا وضعي تأمل.

تم وبالخير عم، الكاتب حسين الخواهرزاد. ره‌ببي بده‌ى زاد". (ئه‌م نامیلكه به‌شێكه له ده‌ستخه‌تێك به ژماره (١٩٧٨٩) له (م. و)دا پارێزراوه).

ئه‌م ده‌ستخه‌ته وه‌ك له سه‌ره‌وه نووسم ماموٚستا مه‌لا حسه‌ینی خواهه‌رزاد نووسیویه‌تیه‌وه. به‌پێی دانراوێكی دیكه‌ى كه هه‌ر له‌م ده‌ستخه‌ته‌دایه، ماموٚستا مه‌لا حسه‌ین له گوندی تورجان له خزمه‌تی ماموٚستا مه‌لا محه‌مه‌د حه‌سه‌نی كوڕی ماموٚستا مه‌لا عه‌لی قزلْجیدا سالْی ١٣٠٠ نووسیویه‌تیه‌وه.

له‌و ده‌ستخه‌ته‌یش وه‌رده‌گیرێ، كه ماموٚستا مه‌لا حسه‌ین خه‌لْی گوندی زینوه‌یه كه (زینوه) گوندێكه له ناوچه‌ى سه‌رده‌شت.

نامیلكه‌ى دووه‌م:

نامیلكه‌یه‌كه له شه‌رعدا، باسی ئه‌ندازه و ژماره‌ى ركعاته‌كانی ته‌راویح ده‌كات.

***ئه‌م نامیلكه به‌شێكه له ده‌ستخه‌تی ژماره (٤٣٣٦١ م. و) و نامیلكه‌ى ژماره (١٩)یه له‌و نامیلكانه‌ى له ده‌ستخه‌ته‌كه‌دان. لاپه‌ڕه ١٠١ و ١٠٢ى ده‌ستخه‌ته‌كه‌ى گرتووه‌ته‌وه.***

سه‌ره‌تاكه‌ى ئاوایه:

"بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله الذي بيّن الفروضي والسنن، والصلاة والسلام على من سلك أكمل سنن. وعلى آله وأصحابه الذين لم يميلوا إلى تراويح الى ترويح في الدين..."

كۆتاییه‌كه‌شی ئاوایه:

"ولا يكفر جاحد المجمع عليه غير الدين كوجود بغداد. والحمد لله على ظهور الصواب. والصلاة والسلام على خير من أوتي الكتاب. استخرجه واستنبطه ونقله الفقير الى الله الغني الصمد، خادم طلبة العلم محمود البيتوشي بن محمد. كتبه أقل الأنام ابن الإمام، واغفر اللهم لهم بحرمة سيد الأنام آمين يا رب العالمين"[٤].

ئێمە ئەم دەستخەتەمان ناونا بە دەستخەتی (ابن الامام) و ئەم مامۆستایە ساڵی ١٢٩٢ك ئەم دەستخەتەی نووسیوەتەوە، دەستخەتەکەی پرشی لە نامیلکە و دانراو و فەتاوای مامۆستایانی کورد و دەستخەتەکە تێکڕا ١٢٠ لاپەڕەیە.

تا ئێستە نازانرێ مامۆستا مەلا مەحمود کەی کۆچی دوایی کردووە. ئەوەندە زانراوە تا ساڵی ١١٧٧ك لە (ئیحساء) بووە و دوای ئەوە لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای برایدا گەڕاوەتەوە بۆ بێتووش و لەوێ ماوەتەوە، تا کۆچی دوایی کردووە.

ئەوەندەی دەخەینە سەر، کە مامۆستا مەلا مەحمود تا ساڵی ١١٩١ك لە ژیاندا بووە، تا ئەو ساڵەش وزەی لەش و توانای چاو و هەستەکانی لەجێگای خۆیاندا بوون، وەك لە دەستخەتی ژمارە (٤٠٣) دایە مامۆستا مەلا مەحمود و مەلا ئەحمەدی کوڕی پێکەوە ئەو کتێبەیان موقابەلە کردووە.

جگە لەمانەیش، لەڕێگەی فەقێیەکی مامۆستا مەلا مەحمودەوە شتێکی دی لە ژیانی دەدۆزێنەوە:

مەلا عەبدوڵڵای ماویلی فەقێی مامۆستا مەلا مەحمەمودی بێتووشی، یەکێك لە قوتابیانی مامۆستا مەلا مەحمود بووە.

گەلێ جار باسی ئەوەم کردووە، کە بە داخەوە مامۆستایانی کورد هیچ بایەخێکان بەوە نەداوە چەند فەقێیان بووە. ئیجازەیان بە چەند کەس داوە، لە چەند مەدرەسە دەرسیان گووتووەتەوە، ئەمەیش ئەڵقە گەلێکی زێڕینی لەژیانی مامۆستایان و حوجرە و مەدرەسەکانیاندا ون کردووە.

مامۆستا مەلا مەحمود بێتووشیی، ئەو زانا مەزنە، کە وێنەی لە چەرخی خۆیدا کەم بووە، کێ دەزانێ چەند فەقێ لە خزمەتیدا خوێندوویەتی؟ ئیجازەی بەچەند موستەعیدی ئاخر مادە و مەلا داوە؟ ئەمە وەك بۆ ئەم مامۆستا پرسیاری بێ وەڵامە، بۆ بەشی هەرە زۆری، ئەگەر نەڵێم سەرجەمی ـ مامۆستایانمان هەر وایە.

خۆشبەختانە مامۆستا (عبدالرقیب یوسف) مامۆستایەکی بەڕێزی دۆزیوەتەوە، کە فەقێی مامۆستا مەلا مەحمود بووە، لەڕێی ئەم فەقێیەوە چەند شتێکی پڕ بایەخمان دەست دەکەوێت:

یەکەم: مامۆستا مەلا مەحمود ساڵی ١٢٠٧ك لە ژیاندا بووە و مامۆستا و (مدرس) بووە.

دووەم: ئەم فەقێیە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی مەحمودی کوڕی عەبدوڵڵای ماویلی بووە ـ ***ماویل گوندێك بووە لە ناوچەی ڕەواندز***ـ.

سێیەم: ئەم مامۆستایە شەرحی ئەلفیەی ناسراو بە (البهجة المرضیة)ی لای مامۆستا مەلا مەحموود خوێندوە و حاشیەی بۆ نووسیوە، دوای لێبوونەوەی لە نووسینەوەی کتێبەکەش، باسی نووسینەوەی کتێبەکە و پلەی مامۆستا مەلا مەحمودی بە شیعری عەرەبیی نووسیوە، ئەوەی پەیوەندی بە مامۆستا مەلا مەحمودەوە هەیە، لە نووسینەکەی مامۆستا (عەبدوڕەقیب)ەوە دەگوێزمەوە ئێرە:

زينـــت الحواشـــي بـــالتنقيش
في القريـــة المحميـــة البيتوشـــي
من عند من بـاح ولاح في الـورى
وصـار طـار صـينة فـوق الثـرى
مـــن لـــبس الوقـــار والـــسكينة
وايقـــن المـــسائل الرصـــينة
مــن حــار مــن اسـلوبه الافهـام
وانكــسرت في وصــفه الاقــلام
وكــشف القنــاع والــستر علــى
وجـه ظـلام الجهـل والعلـم جـلا
ويخـــرج المعـــاني مـــن الفـــاظ
ولـــو اشـــر فيهـــا باللحـــاظ
للمــشكلات الــسيف في الفرنــد
بــل مغنطيــسها وســبق هنــدي
وعلـــم روض زهـــت ازهـــاره
وارســـلت لريّهـــا انهـــاره
وفيــه ماتــشتهي لــه الأنفــس
فاليــسق مــن ســلافه الأكــؤس
لازال يعلـو فـضله بـين الـورى
يمـوج مثـل لجـج بحـر جـرى
احمـــد مـــن صـــيره نحريـــرا
اشـــكر مـــن جعلـــه شـــهيرا
هـــا هـــو بحـــر وافـــر تمـــام
ولا تحـــصي ثنـــاءه الانـــام

وما له - يا خلّ - من مثيل
وفاق الخلق طرا - يا خليلي -
فأنه من عنده نيل المنى
مع السرور والنشاط والهنا
وهو الذي فاق على الاغيار
بالعلم والصلاح، والابرار
لا سيما الفصاحة والبلاغة
ما مثله في المصر والمراغة
كذالك في الشام وفي شيراز
كانه من اعرب الحجاز
بل عجز الكاتب واليراع
من كتبه، واليد والذراع
لّهمّ هيمائا له في الجنان
قصرا مرصعا من المرجان
ولؤلؤ فيروزج اللآلي
مثل الذكا يضئ بالليالي
يطيب منه المسك والعبير
من فرشة استخشن الحرير
اسود من بياضه الكافور
ويضرب الدفوف فيه الحور
واجعل له في الدنيا ما يريد
واجعل له خيرا وما يفيد

دوای چەند بەیتێك مێژووی تەواو کردنی کتێبەکەی دەنووسێت کە ئەوە مەبەستی سەرەکیی ئێمەیە، دەڵێت:

وجـــف مـــن مـــداره الـــيراع
يـوم الخمـيس انفطـم الرضـاع
بعد ارتفاع الشمس قبل الهاجرة
وأطلـــب الله ثـــواب الآخـــرة
في آخـر الـشهر الـشريف رمـضا
ن زاده الإلـــه قـــدرا ومـــضا
مـن هجـرة الـنبي خـير الإلْـف
الـف وسـبع مـع خَمـس الألـفِ[٥]

١٢٠٧

واتە مامۆستا مەلا مەحمودی بێتووشی، ساڵی ١٢٠٧ی کۆچی لە گوندی بێتووش مامۆستا بووە و فەقێ و موستەعیدی وەك مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ماویلیی زانا و خوێندەروار لە خزمەتیدا بوون.

هەر لەسەر پشکنین و گەڕانم بەدوای شوێنەواری مامۆستایانی ئەم بنەماڵەیەدا، دەڕۆم و هیوا بڕاو نیم، ئومێدی ئەوەم هەیە لەم شارۆدا بەرهەمگەلێ کۆبکەمەوە، خەرمانی مێژووی زانایانی بێتووش دەوڵەمەند بکەنەوە.

لەبەر ئەم شارۆدا و لەو شتانەی، کە پێش من پەیی پێ نەبراوە، سووچێکی ژیانی کوڕێکی مامۆستا مەلا مەحمودە لەتەك سووچێکی نادیار و نەزانراوی بەسەرهاتی باوکیدا.

خوالێخۆشبوو مامۆستای (خاڵ)، کە لای بەلای بەسەرهاتی مامۆستا مەلا مەحمود و کۆچی بۆ (ئیحسا)دا کردووەتەوە، ڕێگەی لە گەڵ هەواڵی ئەو کۆچە نەکەوتووە، یەکێکیان خێزان و خانەوادەی بووە لە (الاحساء)دا. لەپەنای یەك دوو نووسینی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی مامۆستا مەلا مەحمودی بێتووشیدا هەندێك زانیاری بەسوود دەبینینەوە، لەوانە:

١ـ مامۆستا مەلا مەحمود لە (الاحساء) خێزان و خانەوادەی هەبووە، بڕوایش ناکرێت ژن و خێزانی لە بێتووشەوە بۆ ئەوێ بردبێت. بەڵام ئایا کە چووە بۆ (ئیحساء) لێرە خێزاندار بووە؟ ئەمەیش نازانین. بەڵام ئەوە زانراوە، کە لە (ئیحسا)وە گەڕاوەتەوە بۆ (بێتووش) لێرە جارێکی دی خێزانی پێکەوە ناوە، لەم ڕووەوە مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێ بۆی نووسیم:

کە ساڵی ١١٨٩ك مەلا مەحمود و مەلا عەبدوڵڵای برای لە (ئیحسا)وە دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان، حاکمی بێتووش دەزانێ جووتە برا بەتەمای گەڕانەوەن بۆ ئیحسا؛ چونکە لەوێ قوتابخانەی گەورە و خێزان و جیگەی باش و ڕێزی زۆریان هەبووە، بۆیە دەڵێ: ئەوا مەلا عەبدوڵڵامان لەکیس چوو، با کارێ بکەین مەلا مەحمودیشمان لەکیس نەچێت. ئیتر حاکم کوێخایەکی زیرەکی دەبێت، ئەڵێ: ئەگەر میر بفەرموێت من کارێکی وا دەکەم مەلا مەحمود نەڕواتەوە، میریش دەڵێت: لە قسەت دەرناچم. کوێخا دەڵێ: قوربان ماوەیەکی زۆرە براکەت بە ڕەحمەتی خودا شاد بووە و براژنت ئافرەتێکی جوان و شۆخ و هەڵکەوتووە، بیدە بە مەلا مەحمود، بەهۆی ئەوەوە دڵ دادەهێنێتەوە بە بێتووشەوە و دانکەنی (ئیحسا) دەبێت. میر دەڵێ: تەگبیرەکەت پەسەندە،

بەڵام لەوانەیە مامۆستا بێوەژنی نەوێت، کوێخا دەڵێ: قوربان من تەگبیری دەکەم.

کوێخا دەچێ بۆ خزمەتی مەلا مەحمود و عەرزی ئەکات: میر قەراری داوە نەهێڵێت جەنابت بگەڕێیتەوە بۆ (ئیحساء). ئەگەر داوای شتی وای لێ کردیت بڵێ: براژنەکەتم بدەیتێ ناچمەوە ئەویش ئەوە ناکات؛ چونکە خۆی بەهیوایەتی. کە مامۆستا دێتە سەر گەڕانەوە حاکم عەرزی دەکات: جەنابت نابێ بڕۆیتەوە، ئەویش ئەفەرموێ: براژنەکەتم بدەیتێ ناچمەوە. حاکمیش ئەڵێ: پێشکەشت بێت. ئیتر کوێخا لەجیاتی مامۆستا مەلا مەحمود هەڵئەستێ دەستی میر ماچ ئەکات و بەشایەتی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا لێی مارە ئەکات بەمە مامۆستا مەلا مەحمود لە بێتووش ئەمێنێتەوە و مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئەگەڕێتەوە بۆ (ئیحسا). دوای ئەوە مامۆستا مەلا مەحموود مامۆستا و مودەڕیسی گوندی بێتووش دەبێت، تا کۆچی دوایی دەکات و لەوێ بەخاك دەسپێردرێت، گۆڕی پیرۆزی دیارە و زیارەتگای موسوڵمانانە(٦).

خانەوادەی مەلا مەحمودی بێتووشی لە (الاحساء): لە هەندێ شوێنەوارەوە، کە لەدەستدان، ئاشکرا دیارە، مامۆستا مەلا مەحمود لە (ئیحساء) ژنی هێناوە و منداڵی لێی بووە، بەڵام نازانرێ کەی ژنی هێناوە، چەند منداڵی لێی بووە، دواتر ئەو خێزانە چییان بەسەر هاتووە.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێتووشی:

ئەوەندە ڕوونە، کە مامۆستا مەلا مەحمود کوڕێکی لەو خێزانە ئیحسائیەی بووە، ئەو کوڕە ناوی ئەحمەد بووە، بووەتە خوێندەوارێکی باش و مەلاچاك لەوانەیە جێگەی باوکی گرتبێتەوە.

ئەم مامۆستایە خۆی دەنووسێ، کە لە (الاحساء) لەدایك بووە، بەڵام مێژووی لەدایکبوونەکەی دیاری ناکات، وەك لە دەستخەتی (٤٠٣)ی کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانیدایە، ئەم دەستخەتە مامۆستا مەلا ئەحمەد ساڵی ١١٩٩ك لەگەڵ باوکیدا بەیەکەوە موقابەلەیان کردووە. دەستخەتەکە کە لە (الحدیث)دایە ساڵی ١١٨٤ ئەحمەدی کوڕی عیسای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ضاحیی نووسیویەتییەوە دوور نییە لە (ئیحساء) نووسیبێتیەوە.

دەستخەتەکانی (٢٧٤) و (١٨٧)یش بەرگەکانی یەك و دووی (الکاشف عن حقائق السنن في شرح المصابیح)ی (بەغەویی)ن، کە ساڵی ١١٩٨ نووسیونیەوە و بەراوردیشی کردوون.

ئەوەندە زانراوە مامۆستا مەلا مەحمود ساڵی ١١٧٧ لە (ئیحساء) مامۆستا بووە و قوتابخانەی هەبووە، جا دەبێ ئەحمەدی کوڕی کەی لەوێ لەدایك بووبێ؟ وەك لەسەرەوەیش نووسیمان مامۆستا مەلا ئەحمەد ساڵی ١١٩٨ خوێندەواری باش بووە و، ساڵی ١١٩٩ لەتەك باوکیدا موقابەلەی کتێبی کردووە.

لەمانە بەولاوە شتێکی ڕوونمان دەربارەی ژیانی مامۆستا مەلا ئەحمەد لەدەستدا نییە و هیوادارین لەمەولا شتی دیمان دەستبکەوێت.

دەبێ ئەوەیش نەبوێرم، کە مەلا ئەحمەدێکی دیمان هەیە، کە باوکیشی ناوی مەحمودە. ئەم مامۆستا مەلا ئەحمەدەیش ساڵی ١٢٨٥ك لە بێتووش مامۆستا بووە و، لەوێ دەستخەتی (٢٣٨٤ ـ ٢٣٨٥)ی نووسیوەتەوە.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێش دەڵێ:

مـەلا مـەحمودی بێتووشـی سـاڵی ١٢٤١ك توحفـەی ئیبنولحەجـەڕی نووسیوەتەوە و لە کۆتاییەوە نووسیویە:

"کتبـە محمـود البیتوشـي مرشـد البرزنجـي سـنة (١٢٤١)، ئـەم دەسـتخەتە لەلای (مەلا محەمەدی مـەلا مـەعرووف وەرتـێ) ئیمـامی گونـدی خانـەقای پـیری ماویلییـە، بـەهۆی حـاجی مـستەفای گـەورە دێیـی بـایعی ئـارد لـە گـەڕەکی مامۆسـتایان لای مزگـەوتی شـەهیدانی مامۆسـتایانەوە، مامۆسـتا مەلا ئەحمەدیان ئاگادار کردووەتـەوە، کـە ئەگـەر نـەوەی مـەلا مـەحمودی بێتووشـی بـێن مامۆسـتا - مـەلا محەمـەد مـەلا مـەعرووف ئامادەیـە کتێبەکەیان بداتێ"[٧].

ئـەم مـەلا مـەحمودە مـەلا مـەحمودی یەکـەم نییـە و مـەلا مـەحمودی دووەمـە، مـەلا ئەحمـەدی کوڕیـشی مـەلا ئەحمـەدی دووەم، یـان سـێیەم و زیاترە.

مامۆستا مەلا عەبدوڵلا بێتووشییەکان:

وەك چەند جار باسمان کـردووە لـە کوردەواریـدا - و بەتایبـەتیی لـە نـاو بنەماڵەی زانیارییەکاندا - زۆر باو بووە، کە کوڕ بۆ ڕێزنان لە باوکی خۆی و بـەهیوای پـیرۆزی نـاوی باوکییـەوە، کـە کـوڕی ئـەمیش وەك ئـەو دەربچێت.. گـەلێ جـار کوڕێـك نـاوی بـاوکی خـۆی لـە کوڕەکەیـدا زینـدە و دووبـارە کردووەتـەوە، ئـەم نموونەیـە لـە بنەماڵـەی حەیدەرییەکانـدا زۆر ئاشـکرایە و چـەندین جـار نـاوی ئەحمـەدی کـوڕی حەیـدەر و ئیبراهیمـی کوڕی عاصیم و... کێ و کێ دووپات و چەند پات دەبنەوە[٨].

ئەمـەیش تایبـەتی ئـەم بنەماڵـە نییـە و گـەلێك وێنـەی دیکـەی هەیـە. بنەماڵەی بێتووشیش لەم نەریتە جێگەی شانازییە بـەدەر نییـە و چـەند

محەمـەد و ئەحمـەد و مـەحمود، وەك كـوڕ و بـاوك، چـەند جـار بـەدوای یەكدا دووپات دەبنەوە. ناوی عەبدوڵلایش بـەلای كەمییـەوە سێ جـار لـە ڕشتەی بنەماڵەكەیاندا هاتووە، واتە: عەبدوڵڵای یەكەم و دووەم و سێیەم. كە هەر یەكێكیان شتێكیان دەربارە دەزانین:

عەبدوڵڵای یەكەم: بە مەلا عەبدوڵڵای عەللامەییش نـاوبراوە، مامۆسـتا مەلا عەبدوڵڵای كوڕی شێخ محەمـەدە ، یـەكێك لـە زانـا هـەرە بـەرزەكانی كوردسـتان بـووە و، لـە زانـستەكانی (نـەحو) و (صـەرف) و (بەلاغـە) و (عەرووضی) و... دا چەندین شوێنەواری نایابی بەجێ هێشتووە. شـیعری بەرزی بەزمانی عەرەبی و فارسی و كوردی هەبووە. شـیعرە كوردییـەكانی دیار نین و لەوانەیە تێدا چووبن. مامۆستا شێخ محەمەدی خـاڵ كتێبێكـی باشـی لەسـەر ژیـان و بەرهەمـەكانی بـەزمانی عـەرەبی نووسـیوە. لـەم دواییەشـدا قوتابیـانی كـوردی زانكۆكـان بڕوانامـەی ماجـستێر و دكتـۆرا لەسەر دانراوەكانی دەنووسن، منیش ماوەیەك لەمەوبەر وتارێكم بەزمانی عەرەبی لەسەر هەندێ لایەنی تـازە دۆزراوەی ژیـان و بەرهـەمی مامۆسـتا مەلا عەبدوڵڵا نووسی[٩].

مەلا عەبدوڵڵای دووەم:

بـەپێی ئـەو زانیارییانـەی لـەم لاو لا لەسـەر مامۆسـتایانی بێتـووش كـۆم كردوونـەتەوە، پێش من كەس باسـی ئـەم مامۆسـتایەی نەدركانـدووە. ئـەم مامۆسـتایە وەك مـن زانیومـە هاوچـەرخی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵای گەورەی بێتووشی بووە و كتێبی ئەویشی نووسیوەتەوە.

دەستخەتێکی کتێبی (تحف الخلان لاشحاذ الاذهان)ی دانـراوی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵای نووسـیوەتەوە، دەسـتخەتەکە بـە ژمـارە (٤١٦/ خ) لـە کتێبخانەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵدا پارێزرابوو.

ئەم مامۆستایە لە کۆتایی دەستخەتەکەوە ئەمەی نووسیوە:

"تمـت النـسخة اللطيفـة الـشريفة المـسماة بالالغـاز النحويـة، مـن تأليفـات شيخنا وسيدنا مولانا عبدالله الكردي الآلاني البيتوشـي صـانه الله كـل بكـرة وعشي. بقلـم الحقـير الفقـير عبـدالله بـن علـي بـن محمـد البيتوشـي، وذلـك خدمـة وامتثـالا لأمـر مولانـا مـلا (لێـرە دا ناوەکـە کوژێنراوەتـەوە، لـەوە دەچێت (خـضر الـسنجوي) بێـت) في شـهر صـفر المظفـر، في سـنة ١١٩٠ مـن هجرتـه ـ صلى الله تعالى عليه وعلى آله وصحبه عـدد مـا جـرى القلـم في ام الكتاب، وعدد ماكان ويكون آمين"

هـەر ئـەم مامۆسـتایە دەسـتخەتی ژمـارە (٢٨٥٠٤م، و)ی سـاڵی ١١٩١ی، بەشێکی لە گوندی بێتووش و بەشەکەی دی لە شاری کۆیە نووسیوەتەوە. لەم دەستخەتەدا ڕشتەی باو و باپیری ئاوا نووسیوە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کوڕی محەمەدی کوڕی ڕەسوڵی ئالانیی بێتووشی.

لێرەدا گومان بۆ ئـەوە دەچێت، ئـەم مامۆسـتا مـەلا عەبدوڵڵایـە بـرازای مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵڵای گـەورە بێـت چـونکە ئـەو عەبـدوڵڵای کـوڕی محەمەدە و، ئـەم عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەلی کـوڕی محەمـەدە. بـەڵام بـاپیری مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای گەورە ناوی (اسماعیل)ە(١٠).

عەبدوڵڵای سێیەم:

دەربارەی ئەم مامۆسـتا ئەوەنـدەم دەسـتکەوتووە، بـەگوێرەی دەسـتخەتی ژمارە (٢٢٤١)ی کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی، ئەم مامۆستایە ساڵی ١٣٠٧ لە

گونـدی بێتـووش مامۆسـتا بـووە و، عـەلی ناوێـك كـە لـە خزمەتیـدا خوێندوویەتی كتێبی (المعفوات)ی مەلا خەلیلی سعرتی نووسیوەتەوە.

مەلا عەبدوڵڵای چوارەم:

لەشوێنێكدا ڕشتەی پشتەكانی بەم شێوە نووسیوە:

عەبدوڵڵای كوڕی ئەحمەدی، كوڕی مـەحمودی، كـوڕی محەمـەدی، كوڕی مـەحمودی، كـوڕی محەمـەدی، كـوڕی مـەولانا ئیـسماعیلی، كـوڕی مـەولانا ئیبراهیمی، كوڕی عیزەدینی بێتووشی.

ئەم مامۆستایە دانراوێكی هەیە، بە ناوی (اعقـاد الـدار في ایضاح شـواهد المختــصر)، نوســخەكەی كــە بــە خــەتی دانەرەكەیــەتی و ســالّی ١٣٢١ نووســیویەتیەوە، بــەژمارە (٢٤٠٨) لــە كتێبخانــەی ئــەوقافی مەركــەزیی سلێمانیدا پارێزراوە.

هەر لە شوێنەوارەكانی ئەم مامۆستایە كۆمەڵە، دەستخەتی (٢٥٤٣ ـ ٢٥٤٥) ــ لــە كتێبخانــەی نــاوبراودا پــارێزراوە. كــە ســالّی ١٣٢٥ لــە ســابلاغ نووسیوەتەوە[11].

دەسـتخەتی ژمـارە (٢٤٢٧)یـش، بەخـەتی ئـەم مامۆسـتایە سالّی ١٣٢٧ لـە گونـدی باغلوجـە لـە خزمــەتی مامۆســتا مــەلا عەبــدوڵڵا (الــدری)دا نووسراوەتەوە. ناوی عەلی (پەسوێی)شی بەسەرەوەیە.

دەستخەتی (٢٤٠٠)یش شوێنەواری مامۆستا مەلا عەبـدوڵڵای چوارەمە و لەشاری كۆیسنجەق نووسیوتیەوە.

هەروەها دەستخەتەكانی (٢٤٠٢ ـ ٢٤٠٣)ش دەستخەتی ئـەم مامۆسـتایەنە. بەگوێرەی دەستخەتی (٢٤٤١)یش، ئەم مامۆسـتا مـەلا (عەبـدوڵڵا)یـە سالّی ١٣٤٤ك لە ژیاندا بووە.

ئـەم مامۆسـتا مـەلا (عەبـدوڵڵا) بـەپێی نووسـینی کتـێبی (اعقـاد الـدرر)ەکـەی: زمـانی عەرەبییەکـەی زۆر پـاراو نییـە، بـەڵام بـەو پێیـە ساڵانێك دوای ئەوە لەکۆیە و سابلاغ بووە، وایش پێدەچێت بوونەکەی بـە فەقێتیی بووبێت دەبێ ئەو کتێبەی لەکاتی فەقێتیدا دانابێت. بەڵام لـەوە بەولاوە دانراوی دیمان لەدەستدا نییە.

مامۆستا مەلا ئەحمەدی (بێژوێ)یش دەربارەی ئەم مامۆستایانە هەنـدێ شتی بۆ نووسیوم تیایاندا دەڵێ:

لەگوندی بێتووشدا چوار مەلا عەبدوڵڵای ناودار هەبوون:

١ـ مەلا عەبدوڵڵای یەکەم، ناسراو بە مەلا عەبدوڵڵای عەللامە.

٢ـ مەلا عەبدوڵڵای دووەم، ناسرا و بە (قاضي عبدالله ی ئەعوەر).

٣ـ مەلا عەبدوڵڵای ڕەش مەشهوور بە (موفتی).

٤ـ مەلا عەبدوڵڵای چوارەم ناسراو بە (ئیمام).

مامۆستا مەلا ئەحمەد دەربارەی مەلا عەبدوڵڵای دانـەری (اعقـاد الـدرر) دەڵێ: ساڵی ١٢٨٦ لە بێتووش لەدایك بووە، ساڵی ١٣٢١ کتێبی (اعقـاد الـدرر) داناوە. هۆنـراوەی زۆر بـووە، لـە شـەرعدا زۆر شـارەزا بـووە، سـاڵی ١٣٢٨ لـە خزمەتی مامۆستا قـادری کـانی کەوەییـدا ئیجازەی تـەدریس و مەلایـەتی وەرگرتـووە. سـاڵی ١٣٦٦ لـە بێتـووش لـە تەمـەنی ٨٠ سـاڵیدا کۆچـی دوایـی کردووە.

لەبارەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ڕەشی ناسراو بە (موفتی)یش دەڵێ: لە دەوروبەری (١٢٨٠)دا لە گوندی بێتووش لەدایك بـووە، مامۆسـتایەکی چـاو نەترس و تیا نـەوەستاو و بەسام بووە، ناحەقی پێ قـوت نـەچووە، لەتـەك

ئاغاكانی میراودەلیدا لە كێشەدا بووە. ئەم مامۆستایە ساڵی ١٣٦٠ك كۆچی دوایی كردووە.

لەتەك مامۆستای قازیی كۆیە و مامۆستا مەلا عەبدوللەتیف ناوێكدا لە نامە و باسێكدا ناوی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای ڕەشی پشدەریی هاتووە، وا پێدەچێت كە ئەم مامۆستا مەلا عەبدوڵڵایە و ئەو مامۆستا مەلا عەبدوڵڵایەی تر، كە مەبەست مەلا عەبدوڵڵای سێیەمە و بە مەلا عەبدوڵڵای ڕەش ناسراوە، یەك كەس بن[١٢] بەڵام مێژووەكانیان لە گومان بەدەر نین.

دیارە دەبێ بەسەر ئەوەشدا نەڕۆم، كە دەستخەتی ژمارە (٤٣٣٦١ م. و)، كە لەم باسەدا سوودی لیوەردەگرم و نامیلكەیەكی مامۆستا مەلا مەحمودی بێتووشی و چەند دانراوی مامۆستایانی دیكەی كوردی لەخۆی گرتووە، ساڵی ١٢٩٢ نووسراوەتەوە... نووسراوەكەی لە كۆتایی نووسینەكانیەوە دەڵێ: (ابن الامام)[١٣] واتە ئیبنولئیمام نووسیویەتییەوە، ئیتر نازانم پێوەندیی بە مەلا عەبدوڵڵای ئیمامی بێتووشییەوە هەیە، یان نا؟

دەربارەی مەلا عەبدوڵڵاكانی بێتووشی، نامەیەكم لەلایە بە ڕوونی دیار نییە بۆ كام مەلا عەبدوڵڵایان نێردراوە، بەڵام ئەو مەلا عەبدوڵڵایەی، كە نامەكەی بۆ چووە ساڵی ١٣١١ قازی بێتووش بووە. نووسەری نامەكە ناوی خۆی نەنووسیوە، نامەكە بۆ ئەوەیە، كە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا نیكاحی مریەمی خێزانی ڕەحیم لە نیكاحی حەنەفییەوە بكات بە شافیعی.

چەند مامۆستایەكی ئەو سەردەمە شایەتی ئەو باسە بوون و ناویان و مۆریان بە كاغەزەكەوەیە، كە ئەم ناوانەن.

مەلا محەمەد ڕەحیمی (شوی)، سەید ڕەزای واژەیی، سەیید ئەحمەدی واژەیی، مەلا محەمەد حسەینی تەوەکەڵیی. مەلا (فرج الله).

هەر لەم بارەیشەوە قەسیدەیەکی شێخ مەعرووفی نۆدێیم لەلایە، کە ماموستا مەلا مەمەدی ئیبنولحاجی بانەیی بۆ برای خۆشەویستی مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی نووسیوەتەوە.

هەروەها پارچەیەك شیعری عەرەبیم لەلایە لەسەری نووسراوە نامەی مەلا عەبدوڵڵای سێیەم، بۆ خزمەتی مەلا محەمەدی کوڕی شێخ بەڵام نامەکە کە بە زمانی عەرەبییە، لە ڕووی زمان و کێشەوە زۆر لاوازە، بۆیە نووسینیم بەلاوە پەسەند نەبوو.

ماموستا مەلا (ڕەسول)ەکانی بێتووشی:

لەناو زانایانی بێتووشدا وەك چەند ماموستا مەلا عەبدوڵڵا هەبووە، هەروەها چەند ماموستا مەلا (ڕەسول)ێکیش هەبوونە.

یەکەمیان:

ئەگەر وا دابنێین ماموستا مەلا عەبدوڵڵای دووەم باو باپیرانی مەلا و مەلازادە بوونە، ئەوا (مەلا ڕەسوڵی یەکەم) ئەو ڕەسووڵەیە، کە باپیرە گەورەی مەلا عەبدوڵڵای دووەمە، ئەوکاتە ئەم ماموستایە، بەیەکێك لە ماموستا دێرینەکانی ئەو بنەماڵەیە دادەنرێت؛ چونکە سێ پشت پێش هەردوو مەلا عەبدوڵڵای یەکەم و دووەمە، کە لە (١١٩١ك) دا لەژیاندا بوون.

دووەمیان: ماموستا مەلا ڕەسوڵی کوڕی حاجی قادری بێتووشییە. ئەم ماموستایە لە دەستخەتی ژمارە (٢٤٠٨)ی کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانیدا ناوی هاتووە. دەستخەتی ژمارە (١٦٨٧٤ م، و)ش، کە کتێبی (عەبدوڵڵا

یەزدییـە) محەمـەد طـاهـیری کـوڕی حـاجی خـضر بـەگ سـاڵی ١٣١١ك لـە خزمەتی ئەم مامۆستا مەلا ڕەسوڵەدا نووسیویەتییەوە.

سـێیەم: بـەپێی دەسـتخەتی (ملتقـی الابحـر) کـە سـاڵی ١٣٢٠ك لـە شـاری کـەرکوك نووسـراوەتەوە، دەبـێ قـازی ڕەسـوڵێکی بێتووشـیش هـەبێت؛ چونکە نووسەرەوەی ئەم دەسـتخەتە دەڵێ: مـنی بێـچارە، کوڕەزای قـازیی ڕەسووڵی بێتووشیی ئالانی ئەم دەستخەتەم لە شـاری کـەرکوك نووسـیووە، لە مۆرەکەیشی (یارسول مدنی) هەڵکـەنراوە، لـە خواریـشیەوە نووسـیویە: ڕەسوڵی کوڕی مەحموودی کوڕی ئەحمەد.

جـا ئەگـەر ئـەم خـۆی نـاوی ڕەسـوڵ بێـت، بـاپیرە گەورەیـشی (قـازیی ڕەسوڵ)ی ناوبێت، ئەوا ڕەسووڵەکانیش دەبن بە چوار.

بـەگوێرەی پـەراوێزێکی دەسـتخەتی ژمـارە ٤٤/٤١٢ کـە لـە کتێبخانەکـەی خۆمدایــە، مامۆســتا مــەلا ڕەسـوڵی بێتووشــی ســاڵی ١٣١٩ك مامۆســتای مزگەوتی حاجی مەلا عومەر بووە، لە شاری کۆیە[١٤].

هەر لەبارەی ئـەم مامۆسـتا مـەلا ڕەسوڵە و نەوەکانییـەوە، دکتـۆر فوئـاد مەعسووم بۆی گێڕامەوە:

مـەلا نـەجیم کـوڕی مامۆسـتا مـەلا ڕەسـوڵی بێتووشـی بـووە و ئیمـامی مزگـەوتی گـەورەی کۆیـە بـووە، لەسـاڵانی ١٩٥٦ و ١٩٥٧دا کۆچـی دوایـی کردووە.

هەروەها د. فوئاد بـۆی گێڕامـەوە کاتێـك لـە کۆیـە فـەقێ بـووە، پـڕ سـێ گونیە کتێب و دەسـتخەت و کاغـەزیان هێنـاوە، کـە پاشمـاوەی کتێبخانـەی مامۆستا مەلا ڕەسوڵی بێتووشی بوون، لە مزگەوت دایانناون. دکتۆر فوئـاد

وتی: من چەند دەستخەتێکم لێ هەڵبژاردن ئەوانی دیمان خستە تاقەکانی مزگەوت، دوایی نازانم چییان بەسەر هات.

هەر لەبارەی خانەوادەی بێتووشییەوە دکتۆر فوئاد وتی: لەو خانەوادەدا ئەفسەرێك هەبوو ناوی حەمە صاڵی بێتووشی بوو، یەکێك بوو لەو ئەفسەرانەی لە سەرەتای دامەزراندنی سوپای عیراقدا لە کوللیەی عەسکەری دەرچووبوو. ئەو ئەفسەرە ماوەیەکیش ئامری خەستەخانەی ڕەشیدی عەسکەری بوو، لەم ساڵانەی دواییدا - کۆچی دوایی کرد[١٥].

زانایەکی دیکەی بنەماڵەی بێتووشی، عەبدولکەریمی کوڕی مەحمودی بێتووشییە، لەساڵی ١٢٩٧ لە ژیاندا بووە و کتێبی (شرح العقائد النسفیة)ی نووسیوەتەوە، کە بە ژمارە (٢٤٤١) لە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانیدا پارێزراوە.

چەند زانایەکی دیکەی بێتووشی:

بێجگە لەو زانا و مامۆستایانەی، کە لە ڕشتەی بنەماڵەی بێتووشییەکاندا ناویان هاتووە و شتێکم لەسەر نووسین، لە پەراوێز و کۆتایی دەستخەتەکاندا ناوی چەندین مامۆستای دیکەی بێتووشیم دیوە، لێرەدا ناوی ئەوانیش دەخەمە پاڵ ئەوانی دی:

١ـ مەلا مصطەفای بێتووشی وادیارە دوو مەلا مصطەفای بێتووشی هەبوونە:

یەکەمیان: (مصطەفای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەمەدی بێتووشی)یە، بە گوێرەی دەستخەتی (١٩٢٠٩/ ٣ م. و)، ئەم مامۆستایە ساڵی ١٢٩٣ لە مەدرەسەی مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێییدا (قول أحمد)ی نووسیوەتەوە.

دووەمیان: (مصطفەفای کوڕی محەمەدی بێتووشی)یە، دەستخەتی (٢٢٦٥٣ م. و)، کـە دانـراوی (قاضـي حـسيني ميبـدي)يـە، لـە شـاری هـەولێر، لـە مەدرەسەی مەلا عومەر ئەفەندیی ئەربیلی نووسیویەتەوە.

مـصطفەفـای پـاپلانیی دەسـتخەتی ژمـارە (١٩٢٠٩ م. و)ی، کـە کۆمـەڵێك دانراوی تێدایە، لە ساڵی ١٢٩٠ بۆ مەلا مصطفەفای بێتووشی نووسیوەتەوە.

هەروەها ئەم مصطفەفای پاپلانییە ساڵی ١٢٩٦ دەستخەتی ژمارە (٢٤٢٦)ی ئەوقافی سلێمانیی بۆ مامۆستا مـەلا مـصطفەفـای بێتووشـی نووسـیوەتەوە، بـەڵام نـاوی بـاوکی نەنووسـیوە و نـازانین کـام لـەم دوو مامۆسـتا مـەلا مصطفەفا بێتووشییانەیە.

لە دەستخەتی ژمارە (٦٩٣٥ م، و)دا شـیعری مـصطفەفـای بێتووشـی هەیـە. ئەمەیش ـ دووبارە ـ نازانم کام لەو دوو مامۆستا مەلا مصطفەفایەیە.

٥ـ عەبدولکـەریمی کـوڕی مـوفتی بێتووشـی سـاڵی ١٣٥٣ و ١٣٥٤ نامیلکـەی (العـروض والقافيـة) و (الفوائـد الحـسنية)ی مـەلا عومـەری (کـچك مـلا)ی ئەربیلی نووسیوەتەوە، ئەم دەستخەتانەم لە لای مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف بینی، ژمارە (١/ ١٤٨ع، ٢/ ١٤٨ع)م دانێ.

٦ـ مـەلا صـاڵحی بێتووشـی سـاڵی ١٢٨٨ لـە مەدرەسـەی گـەناو لەخزمـەتی مامۆسـتا مـەلا عەبـدوڵلای بێتووشـیدا دەسـتخەتی ژمـارە (٢١٣١٧ م. و)ی، (حسامکاتی)یەی نووسیوەتەوە.

٧ـ لـە کۆتـایی پارچـە زەوائیدێکـەوە، کـە حاشـیەیەکی عەبدولکـەریمی هیندیی تێدایە نووسراوە: کاتبە (اسماعيل بيتوشـی) بـەڵام نەمێژوویـەك، نە شتێکی دیکەی نەنووسیوە.

پاشماوەی کتێبخانەی بنەماڵەی بێتووشی:

ئاشــكرایه بــەهیچ شــێوەیەك نــاتوانین ســەرجەمی دەســتخەتەكانی كتێبخانــەی بنەماڵــەی بێتووشــی بــزانین؛ چــونكه ئــەو دەســتخەتانه نــەپارێزراون و بەگــەلێ شــوێنی جیهانــدا بــڵاو بوونەتــەوە، بێگومــان زۆریشیان به یـەكجاری تێداچوون، لـەم باسـەدا بـەگوێرەی پێویـست و بـۆ وەرگـرتنی زانیـاریی لێیـان نـاوی هەنـدێكیانم هێنـاوە، چـەند دەسـتخەتی دیكەیش هەن ناوی زانایانی ئەو بنەماڵەیان پێوەیه، بێ سوود نابێت ناوی ئەوانیش تۆمار بكەم، بەڵكو لەمەولاش زیاتریان بدۆزرێتەوە:

١ــ دەســتخەتی ژمــارە (٢٣٢٢ ســلم) شــەرحی (حــرز الامــاني)یــە، لــە كتێبخانــەی مامۆسـتا مـەلا مـەحمودی بێتووشـیدا بـووە و نـاوی ئـەوی بەسەرەوەیە.

٢ـ دەسـتخەتی ژمـارە (٢٨٧٣ سـلم)، كتـێبی (شـرح المغـني)یـە، نـاوی مـەلا محەمەدی بێتووشی بەسەرەوەیه لەتەك، مێژووی ١٣١٠دا.

عەبدولكـەریمی كـوڕی خـضری كـوڕی ئەحمـەد سـاڵی ١٢٣٨ لـە گونـدی (بست) نووسیویەتیەوە.

٣ـ دەستخەتی (٢٥٣٠ سلم)، (تحفة الطلاب)ە، لەتەك چەند دانـراوی دیـدا كـۆ كراونەتـەوە، نـاوی مامۆسـتایان مـەلا مـەحمود و مـەلا عەبـدوڵڵای بێتووشی له ساڵی ١١٧٦ دا بەسەرەوەیە.

٤ـ دەستخەتی (٤٣٦ سلم)ش (شفاء الصدور شرح الشذور)ی ئیبنوهیـشامە، نـاوی مـەلا مـەحمودی بێتووشـی بەسـەرەوەیە. دواتـریش وەقفـی كـاك ئەحمـەدی بەسـەرەوەیه كـە وەقفـی كـردووە لەسـەر زانایـان و قوتابیـانی شاری سلێمانی. مێژووی وەقفەكـەش سـاڵی (١٢٨٣)یـە. دەسـتخەتەكە سـاڵی (١١٨٥) له لایەن (ئەحمەدی كوڕی عیسای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی ضاحي)

یـەوە نووسـراوەتەوە. دوور نییـە هـەر لەبنەڕەتـدا ئـەم نووسـەرەوە لـە (الاحساء) بۆ مامۆستا مەلا مەحمودی نووسیبێتەوە.

٥ـ دەستخەتی ژمارە (٢٢٢٩ سلم)، (تحفة الطلاب)ەو ناوی شێخ مەحمودی بێتووشی بەسەرەوەیە.

٦ـ چەند لاپەڕەی قورئانی پیرۆز، کە سوورەتەکانی (الکهف) و (طـه)یـان تێدایە. بە خەتێکی جوان و بەمەرەکەبی ڕەش و سوور نووسراونەتەوە.

سەرەتا لەلای محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی عوبەیدان بوون، ئەمە لەساڵی ١١٧٤دا بووە. دوای ئەوە بە کڕین کەوتوونەتە لای مامۆستا مەلا مەحمودی بێتووشی، بەڵام ساڵی کڕینەکەی دیاری نەکردووە.

ئەم دەستخەتەم لەلای مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقاف بینی.

فەرمانڕەوایی بێتووشی و مامۆستایانی بێتووشی

لـەکاتی گـەڕانم بـەناو پاشمـاوەی شـوێنەواری مەدرەسـەی بێتـووش و بەسـەرهاتی مامۆسـتایانیدا، چـەند زانیارییـەکم دەسـتکەوت لـە فەرمانڕەواییەتێك دەدوێـن، کـە لـەو سـەردەمانەدا کـارا بـووە و دەوری لـە ناوچـەکەدا هـەبووە، تەنانـەت هەنـدێ جـار فـەرمانڕەواکان یـان دەسـتە و دایـەرەیان کێـشەیان بـۆ مامۆسـتایانی بێتووشـی دروسـت کـردووە، بۆیـە بەباشی دەزانم لەڕووی ئەو زانیارییانەوە، ئاماژە بۆ ئەو فەرمانڕەواییـە و فەرمانڕەواکانیشی بکەم، هەرچەندە

بـە درووسـتی سـەرەتا و کـاتی دروسـتبوونی ئـەم فەرمانڕەواییـە نـازانم. یەکەم ئاماژەیەك لەو بارەوە لـە دەسـتدا بێـت، ئەوەیـە پـێش سـاڵی ١١٥٥ك ١٧٤٢ز شێخە بەگ فەرمانڕەوایی بێتووشی بـووە، ئـەوەیش نـازانم بـەگ لـە کەیـەوە فـەرمانڕەوا بـووە، هـەروەك ئـەوەیش ڕوون نییـە، ئـەو یەکـەم

فـەرمانڕەوا بـووە، یـان پـێش ئـەویش فـەرمانڕەوا، یـان فـەرمانڕەوایان هەبوون.

ئەوەندە دەزانین شێخە بەگ لەساڵی (١١٥٥ك - ١٧٤٢ز) کوڕی بووە، ناوی ناوە یوسف، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی بە پارچەیەك شیعری فارسی ساڵی لەدایکبوونی ئەم کوڕەی دیاری کردووە، هەروەها لە شیعری مامۆستا بێتووشییەوە دەردەکەوێت ئەم (یوسف بەگ)ە، بووە بە فەرمانڕەوای بێتووش، واتە شێخە بەگ فەرمانڕەوای یەکەمی ناسراوی بێتووشی بووە و یوسفی کوڕی فەرمانڕەوای دووەم. فەرمانڕەوایی یوسف بەگ لەساڵی ١١٨٠ك ١٧٦٦ز و دوای ئەو مێژووەدا بووە، بەڵام نازانرێت تا کەی دەوامی کردووە[١٦].

دوای ئەوە هەواڵێکی درووستی ئەم فەرمانڕەواییەمان لەدەستدا نییە، تا ساڵی (١٢٩٣ك - ١٨٧٦ز) لە دەستخەتی ژمارە (١١٥٠)ی کتێبخانەی مەرکەزی ئەوقافی سلێمانیەوە ئەوە دەردەکەوێ، کە مصطەفا ئاغا لەو ساڵەدا فەرمانڕەوای بێتووش بووە.

جێگەی خۆیەتی لێرەدا باسی ئەوە بکەم، کە ئەم مصطەفا ئاغایە کێشە و سەرئێشەی بۆ مامۆستایانی بێتووش دروست کردووە و ژیانی لێ تاڵ کردوون، ڕوون نییە کێش و سەرئێشەکە چۆن بووە، بەڵام دیارە لە سنوورێکی فراواندا بوون و کار گەیوەتە ئەوەی، مامۆستایانی بێتووش پەنا بەرنە بەر کەسانی خاوەن دەسەڵات و خاوەن ڕێز و داوای لابردنی ستەمی مصطەفا ئاغا و دەستە و بەستەکەی لەسەر مامۆستایانی بێتووش بکەن.

بۆئەم مەبەستە مامۆستایانی بێتووش پەنایان بۆ لای شێخ مصطەفای بەرزنجی بردووە، کە ئەوکاتە موفتی سلێمانی بووە، مامۆستا شێخ مصطەفایش نامەیەکی بۆ مصطەفا ئاغای فەرمانڕەوای بێتووش نووسیوە[١٧]، لە نامەکەیدا سەرکۆنەی مصطەفا ئاغای کردووە و داوای لێ کردووە، کە ڕێز لەو مامۆستایانە بگرێت و ئەگەر ئەو بێڕێزییەی، بەرانبەر بەو مامۆستایانە بەردەوام بێت ئەوا مامۆستای بەرزنجی[١٨] ئەو مامۆستایانە دەهێنێتە سلێمانی و جێگە و ڕێگەی شیاویان بۆ دابین دەکات.

ئەوەندە لە دەستختەکان وەردەگیرێت، کە مصطەفا ئاغا تا ساڵی ١٣٠٠ فەرمانڕەوا بووە و لەساڵی (١٣٠١ك ـ ١٨٨٣ز) بریندار کراوە، ئیتر دیار نییە دوای ئەوە چی بەسەرهاتووە.

هەر بە گوێرەی دەستختی ژمارە (١١٥٠)ی کتێبخانەی ناوبراو ساڵی (١٣٠٠ك/ ١٨٨٢ز) ظاهیر ئاغای کوڕی بایز ئاغای دولکانیی فەرمانڕەوای بێتووش بووە. بەڵام ئەوەیش نازانرێت چۆن لە یەك ساڵدا دووکەس فەرمانڕەوای ئەو شوێنە بوونە؟!

لێرەدا دەقی نامەکەی موفتی سلێمانی بۆ مصطەفا ئاغا دەخەمە ڕوو:

دەقی نامەکە وەك خۆی:

کراما مهربانا

اولا مطلب اصلي استعلام حالات آنجناب محبت مآب است، ثاني چون مصلحت ديني و دنيايي آنسدور موانف! آثار منظور نظر محبت است، لهذا بمقام مصلحت جوى آمدم آينكه بر آنجناب لازم وواجب است: كه دايما در

ترويج اسباب دين، وانجاح امور مسلمين سعى وجهد بليغ بعمل آرند، وچونكه از زمرهء اصحاب قدرتند، دايما بايد در احترام وتوقير جانب علماء كة باعث قوام وقيام اركان دين مبين اند بكوشند، واز مال خالص خودتان ادارهء وجه معيشت ايشان ابذال صرف همت فرمانيد، تاكه مثل دنيا خانه آباد آخرت گردند، لكن عكس احوال مشاهده گرديد، تأسف كلّى خورديم، زيرا درين روزها ملايان بيتوشي، كه همگى خاندان علم، وحقوق كلي بر اهل آنسامان دارند، بدينجا آمدند، بيان نقل كردن خودشان بدينطرف كردند، محب نيز چونكه اينماده موجب وهن كار دين و دنياي آنجناب واهل آنجا بود، ابدا تجويز ننمودم، وبعد از دلالت واستمالت كلى، ايشان را ازين كيفيت نادم ساختيم، واين! است ايشان را باز اعاده آنطرف كرديم، اگر چنانچه امتثال امر آلهى، وترويج دين غراى حضرت رسالتپناهى را منظور ميدارند، واز خاطر ما مجان ونيك خواهان گذشت نميفرمايند، كما كان، ايشان در جاى ومكان خورشان اسكان، وآنچه مخصوص ايشان بود بديشان ارجاع وواگــذار خواهند داشت، ولال اگر گذشت از همه جهات خواهند كرد، ما ايشان را بدينجا آورده، بر حسب مطلوب ايشان را جاى ومقام خواهيم داد. ديگر منتظر ارجاع مهمات وبيان اينماده...(١٩) ميباسم.

٢٧ ذي القعده سنة

٣٠١

مفتى لواى

سليمانى

له پشتى نامەكە نووسراوە:

"بنظر انور كرام جهان خود مصطفى آغاى دولكاني رسيده باد".

★ ★ ★

وادياره كێشەی مامۆستايانی بێتووشی درێژەی بووە، وەك پەنايان بۆ لای مامۆستا شێخ مصطفەفای بەرزنجی بردووە، پەنايان بۆلای كاك ئەحمەدی شێخيش بردووە، كاك ئەحمەديش بەدەنگيانەوە هاتووە و نامەی بۆ ئەو كەسانە نووسيوە، كە ستەميان لێ كردوون[20]. بەلام بەداخەوە مێژووی نامەكەی كاك ئەحمەد ديار نييە.

لە نامەكەی كاك ئەحمەد دا، كە بۆ (سيف الدين خان)ی نووسيوە، ديار نييە كە (سيف الدين خان) فەرمانڕەوای بێتووشی بووە يان نا. ئەوەندە هەيە كاك ئەحمەد لە نامەكەيدا باسی ئەوە دەكات، كە ئاغايانی ئالان ئازاری مامۆستايانی بێتووش دەدەن و سووكايەتييان پێ دەكەن و كاك ئەحمەديش بەوە زۆر ناڕەحەتە.

ديارە كە ئالان سەر بە بێتووش بووە و ئەوكاتە ئاغايانی ئەو ناوچەيە لەژێر دەستەلاتی فەرمانڕەوايی بێتووشدا بوونە.

لێرەدا دەقی نامەكەی كاكەحمەديش بۆ (سيف الدين خان) بە دەقە فارسييەكەی وەك خۆی بلاو دەكەمەوە[21].

بەلام پێش دەقی نامەكە ئەوەندە دەلێم: بەپێی دەستخەتی ژمارە (٢٢٤١ - ٢٢٤٠)ی كتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی عەلی ئاغايەكيش فەرمانڕەوای بێتووش بووە، بەلام ديار نييە لەبەرەی مصطەفا ئاغايە، يان نا، هەروەك ديار نييە لە چ سەردەمێكدا فەرمانڕەوای بێتووش بووە.

دەقی نامەكە وەك خۆی:

بجناب حبيبی وابن حبيبی سيف الدين خان! دعای حفظ ايمان وسلامتی جان وفرزندان مي رسانم. بعد السلام ودعا بحصول مرام. عرض است:

ملآيان بيتوش من القديم خاندان علم و ديانت وصلاحت بوده اند ومی باشند، ومحسوبيت بخاندان محب داشته اند، برهمه كس رعايت وصيانت اهل علم از جملهء واجبات است؛ زيرا قوام دين باوهاست. حال آغايان آلان اراده كردة اند خرج از وها بستانند، واوهارا تضييق كرده اند، بر سرايشان ـ كه له الحمد صاحب تسلط واقتدار ند ـ لازم است كه دفع ظلم ازوها بفرمانيد، وبلكه اگر دفع نفرمانيد بمفاد: (كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته) بمحل خطاب ومعاتبهء حضرت باری ـ جل جلاله ـ درمی آنيد. دخيل صد دخيل بفرياد اوها وخودتان برسند! ورفع اين ظلم عظيم از اوها بفرمانيد، احسان عظيم وموجب ممنونی ودعاهای خير محب است.

الداعی الحزين على اهانة العالمين

السيد احمد البرزنجي

مؤر: عبده احمد

پەراوێز:

(١) بڕوانە: فهرس مخطوطات مكتبة الاوقاف المركزية في السليمانية. اعداد محمود احمد محمد، الجزء الاول، مطبعة بغداد. ١٤٠٣هـ ـ ١٩٨٢م، ص: ١٥.

(٢) کە دەڵێن ئەم دوو کتێبەیان لەبەر کردووە مەبەست ئەوە نییە دانیشتبن و کەلیمە کەلیمە و دێر بەدێر لەبەریان کردبن. بەڵکو خۆیان پێشتر ئاگاداری تەواویان لە ناوەڕۆکیان بووە و وەك لەبەریان بووبێ وابووە، کە پێویستییان بە فرۆشتنیان بووە چاوێکیان پێدا گێڕاون و دوایی فرۆشتوویانن.

(٣) بڕوانە: البيتوشي، دانراوی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ، مطبعة المعارف، بغداد، ١٣٧٧هـ ـ ١٩٥٧م ل: ٢٦.

(٤) ئەم نامیلکەم دا بە مامۆستا ئومێد نەجمەدین جەمیل موفتی، بەڕێزیان بە لێکۆڵینەوەوە بڵاوی کردەوە، بڕوانە: رسالة في بيان عدد ركعات التراويح للشيخ محمود البيتوشي، دراسة وتحقيق اميد نجم الدين جميل. گۆڤاری زانکۆی (صلاح الدين) ژمارە (٣٠) ٢٠٠٧.

(٥) بڕوانە: اعلام الكرد، دانراوی عبدالرقيب يوسف (دەستخەت) ژمارەی تەرجەمە (١٠٧٤).

(٦) ئەمەم لە نووسراوێکی مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێ وەرگرت، کە بۆی نووسیوم.

(٧) ئەمەیشم لەو نووسراوەی مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێ وەرگرت.

(٨) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی شەشەم، ل: ١٨٤.

(٩) بڕوانە: البيتوشي، حياته وآثاره، رسالة تقدم بها خطاب عمر بكر الى مجلس كلية الآداب في جامعة بغداد، جزءً من متطلبات درجة ماجستير آداب في اللغة العربية، ١٤٠٤هـ ١٩٨٤م.

هەروەها بڕوانە: الحفاية بتوضيح الكفاية دراسة وتحقيق طه صالح امين. رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين ١٩٩٣ ـ ١٩٩٤.

هەروەها بڕوانە: كفاية المعاني في حروف المعاني، تأليف: العلامة الشيخ عبدالله الكردي البيتوشي، شرحه وحققه شفيع البرهاني. (رسالة ماجستير) الطبعة الاولى، دار اقرأ. سورية دمشق، ٢٠٠٥.

هەورەها بڕوانە: محمد علي القرەداغي، اطلالة جديدة على جوانب من حياة وآثار البيتوشي، گۆڤاری خۆری ئیسلام ـ شمس الاسلام، العدد: ٢٢، ٢٠٠٣.

ئێستەیش لە (الحساء)ی دەوڵەتی سعوودی قوتابی (خالد الجريبان) خەریکی نووسینی بابەتێکە لەسەر بێتووشی بە ناونیشانی (البيتوشي وجهوده النحوية).

(١٠) بڕوانە: البيتوشي ص: ١٠.

(١١) لە دەستخەتەکەدا لەشوێنێکیدا نووسراوە: لەو ساڵەدا خەڵکی سابڵاخ لەگەڵ هۆزەکانی مەنگوڕ و پیران و تیرەی دیبوکریدا جەنگاون.

(١٢) بڕوانە بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم، ل: ٣٦٢.

(١٣) وێنەی ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەی خۆمدا هەیە.

(١٤) نازانم هەر بە ڕێکەوت بووە، مامۆستایانی بێتووش لە شارۆچکەی کۆیە خوێندوویانە و بە فەقێتی لەوێ بوون و دواتریش بە مەلایەتی و دەرس وتنەوە و نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی... یان پێوەندییەکی تایبەتییان بەو شوێنەوە هەبووە؟ لەم باسەدا بوونی فەقێ و مەلا و مامۆستایانی بێتووش لە کۆیە ئاشکرایە.

(١٥) ئەم زانیارییانەی د. فوئاد مەعصوم هەندێکیانی بۆ نووسیوم و هەندێکیشیان بەدەمی لە دانیشتنێکی ڕۆژی ٦/ ٦/ ٢٠٠٧دا لێم وەرگرت.

(١٦) بڕوانە: البيتوشي، ص: ٢٨.

(١٧) ئەم نامەم لەڕێگەی مەلا عوسمانی موفەتیشی ئەوقافەوە دەرتکەوت.

(١٨) مامۆستا شێخ مصطفای موفتی کوڕی شێخ بابا ڕەسوڵی بەرزنجییە، ساڵی ١٢٣٤ك ١٨١٨ز لەدایك بووە. سەرپەرشتاری ئەوقافی سلێمان پاشای بابان بووە.

خاتوو مریەمی کچی کاك ئەحمەدی شێخ خێزانی بووە. پاش مـوفتی چـاومار بـووە، بـە مـوفتی سـلێمانی. سـاڵی (١٣٠٣ك ١٨٨٥ز) کۆچـی دوایـی کـردووە. گۆڕەکەی لە تەنیشت گۆڕی مارفی نۆدێیەوەیە لە گردی شێخ مارف لە سەیوان.

(هەنـدێك لـەم زانیارییانـەم بـە دەمـی لـە مامۆسـتا عبـدالرقیب یوسـف وەرگـرت، مامۆسـتا شـێخ محەمـەدی خـاڵیش لـە لاپـەڕە (٧٧)ی کتـێبی "الـشیخ معـروف النودهی"دا باسی کردوونە).

(١٩) یەك دوو وشەی نامەکەم باش بۆ نەخوێنرایەوە. ئەم نامەم لـە تـەك وتـارێکی کورتدا لە ژمارە ٦٣ی گۆڤاری سلێمانیدا بلاو کردووەتەوە.

(٢٠) مامۆستا مەلا ئەحمەدی بێژوێیی بۆی نووسیم؛ وەك بۆیـان گێڕامـەوە، قـازی مـەلا عەبـدوڵڵای ئـەعوەری بێتووشـی و مـەلا عەبدولکـەریمی مەعنـەویی لـە مەلایانی بێتـووش چوونەتە خزمـەتی کـاك ئەحمـەد و شـکاتیان لـەو کەسـانە کردووە، کە ئازاریان دەدەن. کاکەحمەدیش سێ نامەی بۆ نووسیون:

یەکەم: بۆ مستەفا ئاغای باپیراغا، کە ئەوکاتە سەرداری عەشیرەتی باپیرئاغایی بووە، لە ئالان.

دووەم: بۆ ئاغایانی تر.

سێیەم: بۆ سەردار و سالاری تەورێز.

ئەگـەر وابـێ ئـەم نامـەی ئێـرە یەکێکـە لـەو سـێ نامـەی کاکەحمـەدە، دەبـێ چاوەڕوانی دوو نامەکەی دی بین، بەڵکو!

(٢١) ئـەم نامەیـشم لای مامۆسـتا عوسمـانی موفەتیـشی ئـەوقاف دی و ڕێگـەی دام بلاوی بکەمەوە، سوپاسی دەکەم. (بڕوانە: ژمارە ٧٢ی گۆڤاری سلێمانی).

ئەنجام:

دوای پشکنینی سەرچاوەکان و گەڕان بەناو دەستخەتەکان و وردبوونەوە لە پەراوێزەکانیانەوە ـ وەك لە سەرەتادا ئاماژەم بۆ کرد ـ ئەوەندەم زانیاری لەلا گەڵاڵە بووە کە لەبەر ڕۆشناییاندا بڵێم:

یەکەم: لەناوچەی ئالان و بێتووشدا فەرمانڕەواییەك بووە دەکرێ ناوی بنێین (فەرمانڕەوایی بێتووش) بەڵگەی بوونی ئەم فەرمانڕەواییە لە (١٥٠) ساڵ زیاتر لەدەستدایە.

دووەم: لە بێتووشدا مەدرەسەیەك هەبووە پشتاوپشت مامۆستایانی بێتووشی بەڕێوەیان بردووە و دەرزیان تێدا گوتووەتەوە.

سێیەم: ناوی چەند مامۆستایەکم لە مامۆستایانی بێتووش دۆزیوەتەوە و چیم لە مێژوویان زانیبێ نووسیومە.

چوارەم: مامۆستا مەلا مەحموودی بێتووشی یەکەم زانای ناسراو و زانراوی مامۆستایانی بێتووشە، ئەم مامۆستا پێش ساڵی ١١٧١ك چووە بۆ (الاحساء) لە وڵاتی سعوودییە بەڵام نازانرێت کەی بووە، دوایی گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و تا دوایی ژیانی وماڵئاوایی لە جیهان هەر لە کوردستاندا بووە و بەدروستی مێژووی کۆچی دوایی نازانرێت.





هذا كتاب شرح العلامة
المناوي على شمائل الترمذي
الذي للمفاخر حاوي
جعلنا الله بجاهه
على مولاه من الجنة
مأواه آمين
امين

الواحد المعين من الوجهين وهو الشتم الشامل للرفع والنصب وبه يندفع ما ذكره صاحب
الكشف من بيان للوسواس او للذي وجوز ان يكون حالا من ضمير يوسوس وبدلا من
شر باعادة العامل اي من شر الجنة فان حذف المضاف كالمقاس وان يكون بدلا
من الوسواس [illegible] يعني على ان تكون من تبعيضية اي يوسوس في صدورهم
من جهة الجن انهم لا يعلمون الغيب ويضرون وينفعون ومن جهة الناس كالكهان
والمنجمين كذلك على ان المراد ما يعم القبيلتين قال البغوي عن الكلبي ذكر بعض
العرب انه جاء قوم من الجن فوقفوا فقيل من انتم قالوا اناس من الجن
وفيه تعسف اي ميل وعدول عن الطريق فان الجن سموا جنا لاجتنانهم والناس
ناس لظهورهم من الايناس بمعنى الابصار ولو ثبت انهم سموا به ولانسهم فانهم
يستأنسون بامثالهم او لنوسهم اي حركتهم واضطرابهم فيعم القبيلتين في الاصل الا انه
خلاف المعروف مع ما فيه من شبه جعل الشيء قسما من نفسه فلا يناسب الفصاحة
القرآنية الا ان يراد به الناسي يعني فيجتزئ بالكسرة عن الياء وههنا سر ينبغي ان
ينبه عليه وهو ان كلمات هذه السورة اشتملت من اثنين وعشرين حرفا ككلمات
الفاتحة اشتركتا في ثمانية عشر حرفا واختصت كل واحدة باربعة الفاتحة بالحاء والطاء
المهملتين والضاد والغين المعجمتين والناس بالجيم والخاء والشين المعجمتين والفاء
فلا يبعد والله اعلم ان يكون اشارة الى ان تكامل نزول القرآن من اوله الى اخره
في عدد الحروف التي اشتمل عليها كل من سورتي اوله واخره من السنين وذلك اثنان
وعشرون والثالثة والعشرون سنة القدوم على منزله الحي القيوم وقع الاختتام
بعون المهيمن العلام يوم الاربعاء خامس جمادى الاول المنخرط في سلك شهور سنة
اربع واربعين وتسعمائة كملت حواشي العلامة محقق الروم سعدي افندي
قدس الله سره صبح يوم الجمعة الخامس والعشرون من شهر ذي الحجة الحرام احد شهور
سنة ١١٨٦ ست وثمانين ومئة والف من هجرته صلى الله عليه وسلم كتبها العبد الفقير
الى مولاه الغني به عمن سواه راجي عفو ربه الكريم المنان دخيل الله بن سليمان بن جرس
الاحسائي عفى الله عنهم بمنه وكرمه انه جواد كريم وكان نسخها بمدينة المبرز من الاحساء
المحروسة جعلها الله دار امان بحرمة من انزل عليه القرآن وذلك بامتثال الاسعد الارشد
الموفق لكل خير من الملك المعبود شيخ محمود فتح الله تعالى في مدة حياته بحرمة القرآن
العظيم وآياته امين والحمد لله وحده وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم تسليما

في الرواية والتثبت في النقل واعتبار من يؤخذ عنه والكشف عن حال رجاله واحدا
بعد واحد حتى لا يكون فيهم مجروح ولا منكر الحديث ولا مغفل ولا كذاب ولا من يتطرق
له طعن في قول او فعل او من كان فيه خلل فترك الاخذ عنه واجب لمن عقل وقد روى
الخطيب وغيره عن ابن عمر مرفوعا لا تأخذوا الحديث الا عن من تجيزون شهادته وروى ابن
عساكر عن مالك رضي الله تعالى عنه لا تحمل العلم عن اهل البدع ولا تحمله عن من لم يعرف بالطلب
ولا عمن يكذب في حديث الناس وان كان في حديث رسول الله صلى الله عليه وسلم لا يكذب
ثم في الختم بها اشارة الى عدم الاكتفاء بكتاب الشمائل والحث على اتقان فن الحديث
والاكثار منه وبذل الجهد في مزيد تحصيله وهذا الختم نظير ما وقع في اوايل اكثر كتب
الحديث من الابتداء بحديث انما الاعمال بالنيات بلغنا الله تعالى ببركة المصطفى صلى الله
عليه وسلم اعظم الامنيات وحشرنا في زمرته في الحياة وبعد الممات قال

المؤلف رحمه الله تعالى وقد وافق الفراغ من هذا التعليق الميمون ان شاء الله تعالى اليوم
التالي لآخر ايام التشريق سنة ستة وستين وتسعمائة من الهجرة المبعوثة لكافة الانام
عليه افضل الصلاة واشرف السلام والحمد لله رب العالمين ولا حول ولا قوة الا بالله العلي
العظيم ووافق الفراغ من نسخ هذا الكتاب المسمى بالشمائل شملنا الله تعالى بالخيرات
في الغدو والاصايل اخير وقت العصر يوم الجمعة وهو اليوم العشرون
من شهر رمضان احد شهور سنة خمس وثمانين بعد المئة
والالف هجريه نبويه على مهاجرها افضل الصلوة وازكى التحية
وذلك بقلم اكفقر الحقير المقر بالذنب والتقصير
راجي عفو ربه [illegible] عبد الله بن سليمان
بن [illegible] مولدا ومسكنا
برسم الاجل [illegible] الشيخ
محمود بن محمد [illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]
[illegible]

اقسمت بالله على ناظر
الا دعى الله لمن خطها

[illegible]
بالامن يوم [illegible]

خلاصة البحث

# بقايا حكومة ومدرسة بيتوش

محمد علي القرەداغي

عضو عامل/ الأكاديمية الكردية - أربيل

من خلال البحث والتدقيق في حواشي وخواتيم المخطوطات وبعض الرسائل المتفرقة توصلت الى وجود شبه حكومة محلية في منطقة بيتوش تعاقب على تسيير دفة امورها وادارة شؤنها امراء وحكام محليون، وان عمر هذه الادارة او الحكومة لا تقل عن مائة وخمسين عاما.

كما توصلت الى وجود مدرسة عريقة في بيتوش قدمت خدمات مثلى ـ على ما وقفنا عليها من الادلة ـ اكثر من ثلاثمائة سنة، وكان شيوخ واساتذة هذه المدرسة من علماء بيتوش ومن أبنائها. بل كان من شأن هذه المدرسة أن خرّجت العديد من كبار العلماء ورفدت بهم المدارس الاخرى على نطاق واسع، حتى وصل من علمائها الى الاحساء في السعودية عالمان كبيران هما الشقيقان الملا محمود البيتوشي والملا عبدالله البيتوشي، بل عن العلماء الذين انتشروا في كردستان وخدموا العلم والعلماء في مدارسها ومساجدها، أمثال البيتوشيين في كويسنجق وسليمانية وغيرهما. حاولت لملمة المعلومات عن العلماء البيتوشيين من خلال بقايا مكتبتهم وفي ثنايا المخطوطات الموجودة في المكتبات الاخرى، فكانت الحصيلة هذا الجهد المتواضع عن هؤلاء العلماء الذين لم يجمعهم حتى الآن كتاب، ولم تدون اسماؤهم في سجل او قائمة.

# نووسینی سەردێر و دانانی
# لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا

## توێژینەوەیەکی زانستییە بەمەبەستی
## باشترکردنی ڕاگەیاندنی کوردی نووسراوە

**د. مەغدید خدر ئەحمەد سەپان**
**زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر/کۆلێژی ئاداب – بەشی ڕاگەیاندن**

### پێشەکی:

ڕاگەیاندنی کوردی پاش ڕاپەڕین، کەوتە قۆناغێکی زۆر گرنگ و نوێ لەمێژووی خۆیدا. لە کورتترین کات کورد، بۆ یەکەم جار لە مێژوو بووە خاوەنی دەیان ڕۆژنامە و گۆڤار. ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانەش هەموو ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی گرتەوە. بۆ ئەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، بەباشی دەربچن، پێشتر، سوود لە سێ جۆر ئەزموون وەرگیراوە. یەکەمیان، ئەو ڕۆشنبیرانەی لە گۆڤار و هەفتەنامەکانی ڕژێم کاریان دەکرد و ئەو تۆزە ئازادییەی هەبوو، بە باشترین شێوە بۆ خزمەتکردن لە بواری فەرهەنگی و ئەدەب و زمانی کوردی توانیبوویان بەکاری بهێنن. ئەزموونی دووەم، ئەزموونی شاخ بوو، کە کۆمەڵێك ڕۆشنبیر و شۆڕشگێڕ بەو توانا کەمە، لە

گوند و ئەشکەوت، چاپخانەیان دانابوو، کاریگەرترین بەرهەمیان دەگەیاندە جەماوەر و بەکاری پیرۆزی ڕۆژنامەنووسی هەڵدەستان. ئەزموونی سێیەم، ئەو کادرانەی لە دەرەوەی کوردستان گەڕانەوە، لەگەڵ خۆیان ئەزموونێکی باشی ڕۆژنامەگەرییان لە بوخچەیان هەڵگرتبوو و لە کوردستانی ئازاد بە باشترین شێوە، بۆ گەلەکەیان خزمەتیان پێی دەکرد.

ئەو کادرانەی سەرەوە، زۆربەی هەرەزۆریان، لە ڕێگای ئەدەب یان سیاسەتەوە هاتبوونە ناو ڕاگەیاندن بۆیە، ئەو کارەی پێی هەڵدەستان، زیاتر لە خۆشەویستی ئەوان بوو بۆ ڕاگەیاندن، نەك فێربوون بەشێوەیەکی زانستی و ئەکادیمی.

ئێستا لە کوردستان، ڕۆژنامە و گۆڤار لە پێشان زیاتر دەردەچن، ئەوانیش بە ناوەڕۆك، دەوڵەمەندتر، بە نەخشەسازی جوانتر و بە زمان، باشتر، دەکەونە بەردەست خوێنەران. هەر هەمووشیان، یارمەتی لە حکومەت یان حیزبەکان وەردەگرن.

ئەو کارەی ئێمە بەناوی: "نووسینی سەردێر و دانانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا" بۆ جاری یەکەمە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دەنووسرێ و بەو ئامانجەی لە داهاتوویێکی نزیك، ئەگەر کەموکورتییەك لەو بوارە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان هەبێ، چاك بکرێ، یان هەرنەبێ، ببێتە پەنجەرەیەك بۆ پسپۆرانی بواری ڕاگەیاندن زیاتر بایەخی پێبدەن و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن. گرنگی ئەو بابەتە لەوەدایە، بابەتێکی هەنووکەییە و بۆ ڕاگەیاندنی کوردی زۆر پێویستە. ئامانجی نووسەر، لەم توێژینەوەی، خزمەتکردنی ڕۆژنامەنووسی کوردییە، بۆ ئەوەی لەداهاتوودا، ئەو سەردێرانە بنووسرێن، کە ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی نووسینەکانن، نەك بۆ ڕۆژنامە یان گۆڤار ساغکردنەوە.

بۆ نووسینی ئـەم توێژینەوەیـە، سـوود لـە کۆمـەڵێك سەرچـاوەی گـرنگ، بـە زمانـەکانی، روسـی، سـوێدی، کـوردی، وەرگـێراوە و لەهـەمان کاتـدا، ئـەو نموونانەی بەکار هێندراون، هەموویان لـە ڕۆژنامـە و گۆڤارەکـانی کوردسـتان دەرهێندراون.

## پێناسەی سەردێر:

**سەردێر بریتییە لە نووسینی چەند وشە یان ڕستەیەك، لە پێش گوتار، هەواڵ یان هەر نووسینێکی دیکەی ڕۆژنامەوانی، بە فۆنتی قەڵـەو و ڕەش و گـەورە دادەندرێ تا لە نووسینەکانی دیکە جیا بکرێتەوە.**

## نووسینی سەردێر یان "ناوی گوتار":

هەموو نووسین و بڵاوکراوەیەك لـە ڕۆژنامـەو گۆڤـاردا دەبـێ سـەردێرێکی بـۆ دابنـدرێ بـۆ ئـەوەی نووسـینەکەی پـێ بناسـینەوە، جگـە لـەوەش سـەردێر دادەندرێ بۆ ئەوەی یارمەتی خوێنەر بدا تا باشتر لـە نـاوەڕۆکی نووسـینەکە بگات. ئەگەر سەردێر بۆ نووسین دانەنـدرێ، ڕۆژنامـە بـەو قـەبارە گەورانـەی هەیانە ناخوێندرێنەوە، لەوکات دەرکردنیان هیچ مانایـەك نابەخـشێ، چـونکە نـاتوانێ پـەیامی خـۆی بگـەیێنێت. ئەگـەر پـەیامیش نەگەیێنـدرێ، دیـارە دەرکردنـی ئـەو ڕۆژنامـە یـان گۆڤـارە پێویـست ناکـات، چـونکە بـەهۆی سەردێرەوە، نووسینی نووسەرێك لە نووسـینی نووسـەرێکی دیکـە بەئاسـانی جیا دەکرێتەوە و خوێنەر مـافی بڕیـاردانی خوێندنـەوەی ئـەو نووسـینە یـان یەکێکی دیکەی دەبێ. بەو شێوەیەی سـەرەوە، سـەردێر دەکاتـە کلیـل یـان کۆدی نووسین، کە خوێنەر نووسینەکەی پێدەناسێتەوە و نووسەریش بابەتی خۆی لەناو بابەتەکانی دیکە لێ تێکەڵاو نابێ.

سەردێر لە نووسیندا لەگەڵ وێنە، لە لاپەڕەی ڕۆژنامەی چاپکراو سەرنجی زۆرترین خوێنەر بۆ خۆیان ڕادەکێشن، بۆیە سەردێر ئەگەر قسەی بکردایە، بە خوێنەری دەگوت: تکایە گوتارەکەشم بخوێنەوە! بەهۆی شێوە و جۆری نووسینی سەردێڕیشە، خوێنەر بڕیار دەدات، ئایا ئەم نووسینە شایانی خوێندنەوەیە یان نا[1]؟ سەردێڕ باشترین ڕەنگدانەوەی لەسەر خوێنەران دەبێ، ئەگەر فاکت بەرز بکاتەوە و ئەو فاکتەش کار بکاتە سەر ژیانی خەڵکێکی زۆر، چ بە باشە یان بە خراپە[2].

ئەگەر بۆ ئەم نووسینەی سەرەوە نموونەیەك بهێنینەوە، دەکاتە ئەوەی سەردێرێك لەم جۆرەی خوارەوە دەخوێنیتەوە: **"مووچەی مامۆستایانی کوردستان ٥٠٪ زیاد دەکرێ"** یان **"نەخۆشخانەی ڕزگاری لە هەولێر دادەخرێ"** بەڕای ئەنتۆن کارلگرێن، سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی داگینس نیهێتەری سویدی لە ١٩٠٩– ١٩٢٣: سەردێر دەبێ دوو ئامانجی هەبێ، یەکەمیان: کار بکاتە سەر خوێنەر، کە گوتارەکە بخوێنێتەوە دووەمیان: ئاگاداری خوێنەر لە ناوەرۆکی گوتارەکە بکا[3]. بۆ ئەوەی سەردێر لەگەڵ نووسینەکانی دیکەی گوتار لێك جیا بکرێتەوە، بە فۆنتی گەورە و پیتی ڕەش دەنووسرێ.

ئاشکرایە و هەموو لایەکمان دەزانین، کە ڕۆژنامە بەهۆی سەدرێرەوە دەیەوێ بەرهەمەکەی بفرۆشێ. سەردێر بۆ تێگەیشتنی نووسین زۆر گرنگە. لە ڕۆژنامەکانی کوردستان زۆبەری جار ڕۆژنامەنووس یان کەسی نووسەر خۆی سەردێر بۆ نووسینەکەی دادەنێت و لە زۆربەی جارەکانیش ئەو سەردێرە ئەو دایناوە، پەسند دەکرێ. هەربۆیەش لەکاتی لێکۆڵینەوە لەسەر سەردێر لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا، ئاشکرا دەبێ، کە چەند جۆرەکییان پێوە دیارە و هیچ ستاندارتێك پەیڕەو نەکراوە، چونکە ئەو سەردێرانە لەلایەن کەسانی جیاوە

نووسراون. لەکاتی نووسینی سەردێر گرنگە و چاکە فێڵ لەخوێنەر نەکرێ، جگە لەوەش واباشە مەبەستی سەردێر لەکۆتایی بنووسرێ.
لە دانانی سەردێر، ڕۆژنامەنووس هەن، دوای نووسینی گوتار ناونیشان بۆ نووسینەکەیان دیار دەکەن، هەشە لە سەرەتادا ناو بۆ نووسینەکەی دادەنێ، ئینجا دەست بە نووسینی گوتارەکەی دەکا. بەڵام ئەوەی تا ئێستا زۆرتر باوە، ئەوا شێوەی یەکەمە. گوتار دەنووسرێ ئینجا ناونیشانی بۆ هەڵدەبژێردرێ. گرنگ نییە ئەو سەرناوەی جاری یەکەم بەمێشکدا دێ، بنووسرێ و لێی پەشیمان نەبیەوە. بۆ ئەوەی سەردێری باش دەست بکەوێ، دەبێ زۆر جۆر بنووسرێ تا لەناو ئەوان یەکێکی شیاو هەڵبژێردرێ. لەو ژمارەیەی سەرەوە زۆر جار تەنیا یەك وشە دەگۆڕێت یان پێش و پاشی بۆ دەکرێت، بەم شێوەیە تەواوی مانای سەردێرەکە دەگۆڕدرێ و سەردێری نوێ دەست دەکەوێ. وەك لەسەرەوە نووسیمان، ڕۆژنامەنووس بە گشتی چەند ناونیشانێك دەنووسێ، پاش بیرکردنەوەی زۆر یەکیان هەڵدەبژێرێ. گرنگیشە بزانین کە نابێ پەلە لە نووسینی سەردێر بکرێ. چونکە ئەگەر ناوێك، کە شایانی گوتارەکەیە نەنووسرێ و مافی خۆی پێ نەدرێ، بە دوور نازانرێ، هەموو هەوڵی ڕۆژنامەنووسەکە بەخۆڕا بڕوا و نووسینەکەشی تێك بدا. لەو کاتەشدا وەك دەزانین کەمتر خوێنەران دەیخوێننەوە ئەوانەی دەشی خوێننەوە، لەوانەیە بەئاسانی هەست بە کەموکورتی داڕشتنی نووسینەکە بکەن. ئەمەش دەکاتە ئیفلیج بوونی تەواوی نووسینەکە.
بەڕای زۆر لە ڕۆژنامەنووسانی سویدی و بە تایبەتی ئەوانەی کە لەسەر تیۆری ڕۆژنامەنووسی کتێب و بڵاوکراوەیان زۆرە وەك: **Rune Pettersson**، **Lars J Hulten**،**Soran Larson** لە سەرگوتاردا دەبێ هەوڵ بدرێ، وشەی نێگەتیف (خراپ) بەکار نەهێندرێ و ئەم وشانەش وەك: لەت لەتکردن،

چاودەرهێنان، فیشەك، سووتان یان هەموو ئەو وشانەی هەستی مرۆڤ دەبزوێنن و کاری تراجێدیا و ناخۆش دێننەوە بیر خوێنەران چاکە ڕۆژنامەنووس لە سەردێری خۆیان لێ دوور بخاتەوە. ئاشکرایە لە هەر ژمارەیەکی ڕۆژنامەدا و دەیان نووسین، وەك: هەواڵ، گوتار، ڕێپۆرتاژ، ئینتەرڤیو...هتد. بڵاوکراونەتەوە. هەموو نووسەرێك، ئاواتە خوازە، زۆرترین خوێنەر نووسینەکەی ئەو بخوێنێتەوە، بۆیە بێ ئەوەی ڕۆژنامەنووس پێی بزانێ و هەستی پێ بکا، پێشبڕکێیەك لە نێوان نووسینەکانی ناو ڕۆژنامەکە دەست پێ دەکات. بۆ ئەوەی خوێنەر نووسینێك بخوێنێتەوە، سەرگوتارەکە بڕیار دەدا. بۆئەوەی ماندووبوونەکە بەخۆڕا نەڕوا، لەسەر ئەوە وەستاوە، کە سەردێرەکە چەند توانیویەتی سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕابکێشێ[٤].

سەردێر دەبێ سەرنجی خوێنەر بۆلای نووسینەکە ڕابکێشێت، کە ئەو نووسینە نووسینێکی باشە و زانیاری پێویستی تێدایە. سەردێر دەبێ دەوری لە گەورەکردن بەڵام لە هەمان کات سەرنجڕاکێشان هەبێت و بەچەند وشەیەك بنووسرێ وا لەخوێنەر بکات، تەواوی نووسینەکە بخوێنێتەوە.

سەردێر لە نووسینی دەبێ سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێت و لەهەمان کاتدا وا لەخوێنەر بکات نووسینەکە بخوێنێتەوە. نووسەرانی سەردێر دەبێ لە نووسینی سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێت و ڕەنگدانەوەی نووسینەکەشی تێدا بێت، چونکە سەرنجڕاکێشان زۆر گرنگترە لەوەی تەنیا ڕەنگدانەوەی نووسینەکە بێت یان لەوەی ناوەڕۆکی نووسینەکە باس بکەیت. ڕوودەدات، دەستەی نووسەران، سەردێرێکی ئەوەندە باش و سەنجڕاکێش بۆ نووسینەکە دادەنێن، بەمەش گرنگی ناوەڕۆك لەدەست دەدات.

سەردێر دەبێ خوێنەر بۆ نووسینەکە گلبداتەوە و دەشبێ ئاشکرا و ڕوون بێ کێ چی گوتووە. زۆر جار دەبێ گوتار یان ئەو بابەتەی ڕۆژنامەنووس

نووسیویەتی، لەسەر ئەو سەردێرەی بۆی داندراوە بگۆڕدرێ و هەندێك جاریش سەردێر لەسەر نووسینەکە پێویستە بگۆڕدرێ[٥]. سەردێر بەگوێرەی نووسین و درێژی بابەت دەنووسرێ. نووسینی کورت، سەردێری کورتی هەیە و نووسینی درێژتر سەردێری درێژی هەیە. ئەو ڕۆژنامەی بەردەوام بۆ نووسینی هەواڵی بچووك سەردێری گەورە دادەنێ، لەلایەن پسپۆڕان و خوێنەرانی جیددی، بە ڕۆژنامەی هەرزان و خراپ سەیر دەکرێ. سەردێری کورت لەوانەیە هەندێك جار پڕ زانیاری نەبێ، بەڵام دەبێ ئاگاداری خوێنەر لەناوەڕۆکی نووسینەکە بکاتەوە و دەشبێ ڕاست و دروست و دوور لە درۆ بێ. گەورەیی سەردێر دەبێ بەو جۆرە بێ، کە خوێنەر لێی ڕاهاتووە[٦].

سەردێر سەرنجی خوێنەر بۆ خوێندنەوە ڕادەکێشێ، بەڵام لەهەمان کات خوێنەر تووڕە (غەمبار) دەکات. ئەوان هەست دەکەن، فێڵیان لێ کراوە بەوەی سەردێر بەڵێنی زۆرتر دەدات، لەوەی لە نووسینەکان هەیە[٧]. بۆ نموونە تۆ سەردێرێك دەخوێنیتەوە و نووسراوە: "**مووچەی فەرمانبەران ٥٠٪ لە بەهاری ئەمساڵ زیاد دەکات**". پاش خوێندنەوەی ئەم سەردێرە، ڕوون دەبێتەوە، کە ئەمە جارێ تەنیا پێشنیازی حکومەتی هەرێمە و هیچ وەڵامێك لە بەغدا نەهاتووە. لێرە خوێنەر هەست دەکات فێڵی لێ کراوە، چونکە نووسینەکە ڕەنگدانەوەی سەردێر نییە و سەردێر زۆر زیاتر بەڵێن دەدات، لەوەی لە نووسینەکە هاتووە. سەردێر دەبێ یارمەتی خوێنەر بدات، کەچی سەردێری زۆر هەیە، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ.

وێنە و سەردێر بەیەکەوە یارمەتی خوێنەر دەدەن لە نووسینەکە بگات. ڕۆژنامەنووسان زۆر بایەخ بە نووسینی ژێر وێنە دەدەن، ئەگەر خەڵك گوتارەکەش نەخوێنێتەوە، کۆمێنتارەکە دەخوێنێتەوە. بۆ هەموو نووسینێك سەردێر + لید + وێنە + کۆمێنتاری ژێر وێنە زۆرترین سەرنجی خوێنەران

ڕادەکێشن و ئەوانیش بەیەکەوە بڕیار دەدەن، ئایا ئەو نووسینە بخوێندرێتەوە یان نەخوێندرێتەوە.

## جۆرەکانی سەردێر:

سەردێر لە ڕۆژنامە و گۆڤار چەند جۆرێکی هەیە و هەموو جۆرەکانیش بەکار دێن. ئەگەرچی لە کوردستاندا نەتواندراوە بۆ نووسین سوود لە هەموو جۆرەکانی سەردێر وەربگیرێت. لە ڕۆژنامەی ولاّتە پێشکەوتووەکان، ئەم جۆرانەی خوارەوە بەکاردێن: مقەسی، ناوەڕاستی، لای ڕاست، لای چەپ، خەتی پڕ، یەك خەتی، سەر سەردێر، ژێر سەردێر لەگەڵ سەردێری ناوەوە.

### سەردێری مقەسی:

مەبەست لەم جۆرە نووسینە ئەوەیە، کە سەردێر لە شێوەی مقەسی دادەندرێ. لەم جۆرەیان لەناو ڕۆژنامەکانی کوردی، تەواو پشتگوێ خراوە و هیچی پێ نانووسرێ[٨]. هۆی بەکارنەهێنانیش لە ڕۆژنامەکانی کوردی، لەوانەیە لەبەرئەوەبێت، چونکە ئەوانەی کاری نەخشەسازی ڕۆژنامەکان دەکەن، لە هونەری نەخشەسازی ولاّتانی دیکەی جیهان شارەزاییان کەمترە، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەش، زۆربەی هەرە زۆری نەخشەسازەکان، خۆیان خۆیان فێری ئەم پیشەیە کردووە و ناشوێرن، بەجۆری نوێ بابەتەکان بەسەر لاپەڕەکان دابەش بکەن، چونکە زۆربەی سەرنووسەران و بەرپرسی لاپەڕەکان دەست دەخەنە ناو کاروباری ئەوان، بۆیە ڕێگایان پێ نادرێ و ناوێرن، جۆری نوێی سەردێر لە لاپەڕەکان، هەرنەبێ بۆ هەمەجۆری و جوانی تاقی بکەنەوە و دابنێن. ئەگەر ئەوان دەرچووی پەیمانگا، کۆلێژ، بەشی ڕاگەیاندن یان بەشی نەخشەسازی بوون، ئازادانەتر یارییان بە نووسینەکان دەکرد و ترسیان نەدەبوو، لەوەی بەرپرسی لاپەڕە یان سەرنووسەر گلەیی لێ بکا، چونکە ئەوکات، دەگوترا بەشێوەی ئەکادیمی فێر

کراوە. جگە لەو هۆیانەی سـەرەوەش، ئێمـە بەگشتی سەرچـاوەمان لەسـەر نەخشەسازی و نووسینی سەردێر بە زمانی کوردی نەك کەمـە، بـەڵکو ئەگـەر هەشبێ لەچەند گوتارێك زیاتر نییە. دانـانی سـەردێری لـەوجۆرە نوێیانـە لـە ڕۆژنامەکان، لەسەرەتا تا خوێنەر چاوی ڕادێ، باشە بۆ بابەتی کۆمەڵایەتی و وەرزش سوودی لێ وەربگیرێ، چونکە بەدانانی جوانییەکی دیکە بەڕۆژنامە و لاپەڕەکان دەبەخـشێت. لەبـەر ئـەوەی لـە ڕۆژنامـە کوردییـەکان لـەم جـۆرە بەکار ناهێندرێ، بەپێویستمان زانی بەم شـێوەیەی خـوارەوە بینووسـین، تـا وەك نموونەی زیندوو بدەینە بەردەست خوێنەر و کەسانی پسۆڕ.

XXX XXXX XXX
XX XXXXXXXXX
XXXXXXXXXXXX

**سەردێری ناوەڕاست:** مەبەسـت لـەم جـۆرە سـەردێرە ئەوەیـە، کـە سـەردێر لەناوەڕاستی ئەو ڕووبەرەی بە نووسینەکە دراوە دادەندرێ. ئەمەش دەکـرێ یەك دێریان زیاتر بێت. ئەم جۆرە سەردێرە کۆنترین جۆری دانـانی سـەردێرە و لە ساڵی ١٧٠٠ لە ڕۆژنامە ئینگلیزییەکان بەکار هاتووە و تا ئێستاش بـەکار دەهێندرێ[٩].

**بەشەش**

**مانگ**

**پاڵاوگەی**

**دووەمی نەوت**

**لە سلێمانی**

**تەواو کرا[١٠]**

**خێزانە عەرەبەکان ئاسایشی هەرێمیان بە دیکتاتۆر لە قەڵەم داوە**

**ئەوانەی ئەم دەنگۆ و هەواڵانە بڵاو دەکەنەوە بوغزاوین**[11]

**بەرپرسانی ئەمریکا پێیان گوتین**

**کەرکوك ناخرێتە سەر هیچ هەرێمێك**[12]

لەم جۆرە سەردێرانە لە نێو ڕۆژنامەکانی کوردی: هەفتەنامەی میدیا، کوردستانی نوێ و ڕۆژنامەی ڕۆژنامە لەگەڵ هاوڵاتی کەمتر بەکار دێ.

**سەردێری لای چەپ:**

سەردێری لای چەپ یان دەستەچەپ، لە ڕۆژنامەکانی کوردی تەواو پشتگوێ خراوە و بەهیچ شێوەیەك نووسینی پێ ناکرێ. (لێرە مەبەستمان ئەو ڕۆژنامانە نییە، کە بەپیتی لاتینی دەردەچن). بەڵام لەو ڕۆژنامانەی نووسینیان لەلای چەپەوەیە، زۆر بڵاوە و کاری پێدەکەن.

XXX XX XXXXX

XXXXX XXXX

XXXX XXXX XX

**سەردێری لای ڕاست:**

مەبەست لە سەردێری دەستە ڕاست ئەوەیە، کە نووسینەکە هەمووی لە دەستە ڕاستەوە دادەندرێ و دانەر گوێ بەو بۆشاییە نادات، کە لە دێرەکانی دووەم و سێیەمی سەردێر دێن. ئەگەر لەچەند خەتێکیش داندرابن، هەموویان لە دەستە ڕاستەوە دەست پێدەکەن. لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا سەردێری لای ڕاست لەتەواوی جۆرەکانی دیکە بڵاوترە و لە هەموو لاپەڕەکان و بابەتەکان وەك یەك بەزۆری بەکاری دەهێنن.

**چەند نموونەیەك:**

**حکومەتی هەرێم بە نهێنی و نایاسایی خزمەتی ئاوارەیی و**

**پێشمەرگایەتی بۆ چەند کادیر و فەرمانبەرێك هەژمار دەکات**[13]

**پشووەکانی مانگی ئادار**
**تەنیا وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا دەگرێتەوە**[١٤]
**کۆمپانیایەك شارێکی گەورەی غاز**
**لە کوردستان دادەمەزرێنێ**[١٥]

**سەردێری خەتی پڕ:**

مەبەست لە خەتی پڕ ئەوەیە، کە سەردێر بەچەند دێرێك دەنووسن و هەموو دێرەکانیش درێژییان وەك یەکە یان ژمارەی پیتەکان زۆر لەیەك نزیکن. ئەمەش دەکاتە ئەوەی دوو یان سێ دێر وەك یەك پڕ و درێژن[١٦]. لەم جۆرە سەردێرە لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا بەڕێژەیەکی کەم بڵاوە و لە هەموو ژمارەکان بەکەمی بەرچاو دەکەوێت. لە ڕۆژنامەی هاوڵاتی لە ڕۆژنامەکانی دیکەی کوردی زیاتر پێی دەنووسرێت. لە ڕۆژنامەکانی سوێدی لەسەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردووەوە لەم جۆرە سەردێرە بەکار دێت.

**پەکەکە ئامادەی جەنگە و هەرێمی کوردستان بەجێ ناهێڵێت**
**پێشمەرگە لە ئامادەباشیدایە بۆ وەڵامدانەوەی هێرشی تورکیا**
**لە ئەڵمانیا کوردێك بەتاوانی کوشتنی**
**هاوسەرەکەی بە هەتاهەتایی حوکمدرا**[١٧]

**سەردێری یەك خەتی:**

مەبەست لەم جۆرە سەردێرە، ئەوەیە، کە بەیەك دێر تەواوی سەردێرەکە دەنووسرێ. لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا لەم جۆرە سەردێرە زۆر بەکار دێت و زۆر بەربڵاوە. هەندێك جار ئەو تاکە خەتانە لە ناوەڕاستن و هەندێك جاریش لە دەستە ڕاستن. هەدووك جۆر پێیان دەگوترێ سەردێری یەك خەتی.

**بارزانی داوا لە سەلاحەدین بەهادین دەکات نەچێت بۆ تورکیا**[18]

**پارتی و یەکێتی ڕێگە نادەن ئۆپۆزیسیۆن دروست بێت**[19]

**بەبڕی ٩٠٠ ملیۆن دینار پەناگەیەك بۆ ژنان دروستدەکرێت**[20]

**١٥٠ دۆنم زەوی لــە هــەولێر دەدرێتــە مەکتــەبی سیاســی و بارەگاکــانی یەکێتی**[21]

**سەردێری ناوەوە:**

مەبەست لە سەردێری ناوەوە، ئەو نووسینەیە، کە لـە نـاوەوەی نووسـینەکە بەخەتێکی ڕەش و کەمێك گەورەتر و قەڵەوتر لەو فۆنتـەی تێکستەکەی پـێ نووسراوە دادەنـدرێ. لـەم جـۆرە سـەردێرە دادەنـدرێ بـۆ ئـەوەی یارمـەتی خوێنەر بدات ئاسـانتر لـە نووسـینەکە بگـات. ئـەم جـۆرە سـەردێرە کـەم لـە ڕۆژنامــەکانی کـوردی بــەکار دێــن و زیــاتریش لــە گۆڤارەکـان سـوودی لــێ وەرگیراوە. بۆ ڕۆژنامە زیاتر لە ڕێپۆرتاژ یان چاوپێکەوتن یـان گوتـاری درێـژ دادەندرێ.

سەردێری ناوەوە هەمان ئامانجی سەردێری گەورە یان سەرەکییەکان هەیـە. ئەوانیش باس لە نووسینەکە دەکەن و سەرنجی خوێنـەر بـۆلای ئـەو بەشـەی گوتار ڕادەکێشن. نووسینی سەردێری ناوەوە ئاسان نییـە و دەبـێ یـەك یـان دوو دێر زیاتر نەبن[22].

سەردێری ئەم چاوپێکەوتنە بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە:

**حـــەز دەکـــەین لـــە تەلەفزیۆنەکانـــەوە بەرنامـــە لەســـەر نەخۆشخانەکەمان**

## ببینین تا ئەگەر کەموکوڕییەکمان هەبوو بتوانین چارەسەری بکەین

سەردێرەکانی ناوەوە بەم جۆرە نووسراوە:

**بەشی تاقیگە – ئامێری کۆن باشترە لە ئامێری نوێ**

**منداڵبوون پێویستی بە مامانی هەست ناسکە**

**مەرجی سەختی وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانە**

**پاسەوانی بە پەرۆش و ناشارەزا(٢٣)**

## هەرێمی کۆسۆڤۆ لە ئاستانەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆبوونیدا

سەدرێری ناوەوە بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە:

**لە چاوەڕوانی گڵۆپی سەوزدا**

**پلانێکی تۆکمەی نێودەوڵەتی**

**بڵاوکردنەوەی هێزێکی ئەوروپی**

**بەرهەڵستی سەرسەختانەی رووسیا**

**ئەمەریکا پاڵپشتی سەربەخۆبوونە(٢٤)**

لە زۆربەی ڕۆژنامەکانی کوردستان چ لەوانەی قەبارەیان بەتاڵە وەك ڕۆژنامەی: خەبات، ئاسۆ، هاوڵاتی، جەماوەر... هتد. یان ئەوانەی قەبارەیان تابلۆیدە یان لە تابلۆید نزیکە: هەولێر، ڕۆژنامەی ڕۆژنامە، کوردستانی نوێ ... هتد. سەردێر بە چەند دێرێك دەنووسرێ. لە وڵاتانی ئەوروپا بەزۆری لە قەبارە بەتاڵەکان ئەم جۆرە سەردێرانە بەکار دێت و ئەویش ڕەگی بۆ ساڵەکانی ١٨٠٠ دەگەڕێتەوە و تا ئێستاش لە بەکارهێنانی بەردەوامن(٢٥).

**سەرۆكی كوردستان سەرپەرشتی كۆبوونەوەیەكی ئەنجوومەنی باڵای پارتە سیاسییەكانی هەرێمی كوردستان دەكات**

**ئەنجوومەنی باڵای پارتە سیاسییەكانی كوردستان خۆشحاڵی لە رەزامەندی پەرلەمانی فیدراڵ**

**لە هەرسێ یاسای بودجە و پارێزگاكان و لێبوردنی گشتی دەردەبڕێ**[٢٦]

**چالاكییەكانی سەرۆكی حكوومەتی كوردستان لە كۆریای باشوور**

**نێچیرڤان بارزانی: بۆ پەرەپێدانی ژێرخانی هەرێمی كوردستان دوو یاداشتنامەی**

**لێكگەیشتنمان لەگەڵ ٢ كۆمپانیای كۆریای باشوور ئیمزاكرد**[٢٧]

**سەر سەردێر:**

مەبەست لە سەر سەردێر، ئەو نووسینەیە، كە بە فۆنتی كەمێك بچووكتر لە فۆنتی سەردێر دەنووسرێ و لە پێش سەردێر دادەندرێ. دانانی سەر سەردێر زیاتر بۆ بەهێزكردنی سەردێرە. دانانی سەر سەردێر لە تەواوی رۆژنامەكانی كوردی زۆر بە بەربلاوی و فراوانی بەكار دێت. رۆژنامەنووسان جیاوازی لەنێوان سەر سەردێر لەگەڵ سەردێر دەكەن. سەر سەردێر نووسینی گشتییە و سەردێریش نووسینی دەقیقە. رۆژنامەنووسان رقیان لە سەر سەردێر دەبێتەوە و ئەوان سەردێر دادەنێن[٢٨]. سەردێر دەبێ شتێكی تایبەت بڵێ. بۆنموونە لەسەر سەر سەردێر دەنووسرێ:

**هەڵبژاردن لە كوردستان**

لێرە سەردێر دەبێ بەم شێوەیەی خوارەوە بنووسرێ:

**پارتە بچووكەكان بڕیار لەسەر ئەنجامی هەڵبژاردن لە كوردستان دەدەن".**

مووچە زیادکردن تەنها بۆ دوو ساڵ

**ساڵی ٢٠١٠ دووبارە مووچەی**

**فەرمانبەران زیاد دەکرێتەوە**(٢٩)

**سەرۆك تاڵەبانی پێشوازی کرد لە د. ئەیاد عەللاوی**

**لەبارەی پێویستی ئەنجامدانی چاکسازییە سیاسی و حکومییـەکان گفتوگۆ کرا**(٣٠)

**لەنێوان بێنەوبەرەی ئیدارەی گەرمیان و پارێزگای کەرکوکدا**

**بنکەیەکی تەندروستی بە نایاسایی دادەخرێت**(٣١)

**بەپێی چەند بەڵگەیەکی بەریتانی**

**لە حەفتاکان بەریتانیا چەکی بە ڕژێمی بەعس فرۆشتوە**(٣٢)

**سەردێری ژێر سەردێر:**

لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا، و بەتایبەتیش لـە گوتـارە سیاسـییەکان سـەردێری ژێر سەردێر زۆر بەکار دێت. ئەمەش بۆ ئەوەی یارمەتی خوێنەر بدات، باشـتر لە سەردێر بگات. Omandar ،Andersson لەگەڵ Ostrander لە سـاڵی ١٩٧٨ موناقەشە لەسەر چوار ئاستی (لیڤل) سەردێر دەکـەن. سـەردێری سـەرەکی، سـەردێری خـوارتر، سـەردێری خـوارتر لەگـەڵ سـەردێری خـوارتر. سـێ لـەو ئاستانە وەك یەکن(٣٣).

**جڤاکی کوردی و بزاڤە بازنەییەکانی**

**دیدی هێگڵ لەمەڕ نەگۆڕیی دەستەڵاتە نەریتگرەکانی رۆژهەڵاتیدا**

**دزیکردن لە هەڵەبجەی تـازەدا بـووە بـە پیـشە و وەك پـەتا بـڵاو بووەتەوە**

**بەڕێوەبەری بنکەی پۆلیسی هەڵەبجەی تازە**(٣٤)

**سەردێر بۆ هەواڵ:**

ڕۆژنامە لەبەر ئەوەی پێی دەڵێن ڕۆژنامە، چونکە هەواڵی تێدا. ئەگەر هەواڵ لە ڕۆژنامە نەمینێ، هەمان لاپەڕەچاپکراوەکان بڵاوکراوەیان پێدەگوترێ. کورتە هەواڵیش نابێ ٣٠ — ٤٠ وشە زیاتر بێت. لە ڕۆژنامە کوردییەکان، بەدەگمەن ئەو ستاندارتە جیهانییە پەیڕەو دەکرێ. زۆربەی هەواڵەکان درێژن و بەدەگمەنیش لەلاپەڕە یەك تەواو دەبن و هەر مووشیان خوێنەر بۆ لاپەڕەکانی دیکە ڕەوانە دەکەن. بۆیە ئەگەر لەلاپەڕەی یەك یان لاپەڕەکانی دیکە کورتە هەواڵ هەشبێ، زۆربەی جار سەردێرەکان لەگەڵ ناوەڕۆك ناگونجێن. ناگونجێن لەلایەك لە زۆر وشە پێکدێن، لەلایەکی دیکەش بە خوێندنەوەی، ئەگەر نووسینەکە نەشخوێنیتەوە، هیچ زانیاری لەدەست نادەیت، چونکە ئەو سەردێرەی بۆیان داناوە، کاکڵی بابەتەکەی پێدایت و تەواوی زانیارییەکانی پێبەخشیت. ئەمەش هەڵەیە و بەهیچ شێوەیەك نابێ لەمجۆرە سەردێرانە دابندرێ.

**"سەرۆك کۆماری ئێران، سەردانی هەرێمی کوردستان دەکات**[٣٥]**"** ئەم هەواڵە ٦٠ وشەیە و لە گرنگترین شوێنی لاپەڕە داندراوە. گرنگترین شوێن دەکاتە، لای ڕاستی سەرسەرەوەی ڕۆژنامە. لەنووسین بۆ ڕۆژنامە، نووسەر دەبێ ئاگای لەتەواوی نووسینەکە هەبێ تا بۆی بکرێ مەبەستی بە کورتی و زمانێکی ئاسان دەربڕێ. بەچەند وشەیەکی کەم زیرەکی و توانای ژیربێژانەی خاوەنەکەی پیشان دەدات. ئەمەش لە دانانی سەردێرەوە دەست پێدەکات، تا دەگاتە نووسینەکە خۆی. ئەو سەردێرەی بۆ ئەم هەواڵە داندراوە، لەلایەك تەواوی زانیارییەکانت پێدەدات، بۆیە ئەگەر هەواڵەکەش نەخوێنیتەوە، تۆ زۆر شتت لەدەست نەچووە و لە زانیاری بێبەش نەبوویت، لەلایەکی دیکەش ئەم هەواڵە کورتە ئەم سەردێرە درێژە هەڵناگرێ. دەکرا بنووسرابا:

**"ئەحمـەدی نـەژاد دێتـە کوردسـتان"** یـان **" ئەحمـەدی نـەژاد سـەردانی کوردسـتان دەکـات"**یـان **"سـەرۆك کۆمـاری ئێـران دەگاتـە هـەولێر"** **"ئەحمەدی نەژاد دێتـە هـەولێر"** **"ئەحمـەدی نـەژاد لـە هـەولێر بـارزانی دەبینێ"**. ئەوانەی سەرەوە هەمووی تەواون و جگە لەوانەش، دەکرا وشـەی سەرۆك کۆماری ئێران وەك سـەر سـەردێر بنووسـرابا و سـەردانی کوردسـتان دەکـات، بـە ڕەشـی و گـەورەی بنووسـرابا. لـەوکات پێویـستی نـەدەکرد، فاریزەش بۆ ئەم سەردێرە داندرابا. ئەگـەر بکـرێ یـەك وشـە کـەمتر بـۆ ئـەو کورتە هەواڵانە لە سەردێر دابندرێ باشـە و ئـەو وشـە کەمـە پـسپۆرییەك بـە نووسینەکە و هونەری نووسینی سەردێر دەبەخشێ.

لـە لاپـەڕە دووی هـەمان ژمـارە، چـەند کورتـە هـەواڵێك نووسـراون، بـۆ هەمووشیان سەردێری درێژ داندراوە بۆ نموونە: **"جێگری سکرتێری گشتی، پێشوازی لەو منداڵە کرد کە چارەسەری نەخۆشی شێرپەنجەی ئێسکی بۆ کرا"** ئەم سەردێرە زۆر درێژە و بەئاسانی دەتواندرا کورت بکرێتەوە. وەك لە جیاتی جێگری سـکرتێری گشتی، کـە هـەموو کـەس دەزانـێ مەبەسـت کـاك کۆسرەت رەسولە، دەکرا بنووسرابا: **"کۆسرت رەسـول ڕۆزە سـاڵحی بینـی"** وشەی پێشوازی بۆ کەسانی دەستەڵاتدار لە حکومەت دادەندرێ و وشـەیەکی زۆر رەسمییـە. ئـەو منداڵـە هـیچ پۆسـتی سیاسـی نییـە، بۆیـە لـەجیاتی پێشوازی، بینین بەکار دێت. دواتر لەدرێژەی نووسـینەکە دەکـرا بنووسـرابا، ڕۆزە سالح بۆ چارەسەری نەخۆشی شێرپـەنجە ڕەوانـەی نەمـسا کـرا و پـاش چاکبوونەوەی سەردانی بەرێز کۆسرەت رەسولی کرد.

**"تۆمـەتباری ڕووداوی باتـە ئـازاد کـرا**[٣٦]**"** ئەمـە سـەردێرێکی زۆر بـاش و سەرنج ڕاکێشە، بۆ ئەو نووسینەی سـەرەوە دانـدراوە. **"گـۆڕێکی بەکۆمـەڵ دەدۆزرێتەوە**[٣٧]**"** ئەم سەردێرەش بۆ ئەو هەواڵەی بڵاوکرابۆوە زۆر باشە.

له ڕۆژنامەکانی کوردستان، کورتە هەواڵ زۆر کەم دەنووسرێ و نووسینەکان، زیاتر لە هەواڵی درێژ دەکەن، ئەگەرچی زانیاریدان بە کورتە هەواڵ و بە ٣٠ —٤٠ وشە بۆ ڕۆژنامەکان زۆر پێویستە. نووسینی کورتە هەواڵ، بەو شێوەیەی ئێستا لە ڕۆژنامەکانی کوردی پشتگوێ خراوە، لەوانەیە زیاتر لەبەر تێنەگەیشتنی ئەوان بۆ چۆنێتی نووسینی هەواڵ یان زەرووری بوونی هەواڵ بێت. زۆربەیان، لەو ڕۆژنامەنووسانەی لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا کار دەکەن، خۆیان خۆیان فێری پیشەی ڕۆژنامەنووسی کردووە، ئەوانیش نازانن، مەبەست لە دەرکردنی ڕۆژنامە یان بلاوکردنەوەی هەواڵ زۆر پێویستە. لەبەر کەم شارەزایی ئەوان لە پیشەی ڕاگەیاندن، بەم شێوەیەی سەرەوە کاری لەسەر دەکەن. چەند ئێمە ڕاگەیاندنمان بەرەو پسپۆری بچێ ئەوەندە زیاتر سەردێری کورت و کورتە هەواڵ ڕۆژنامەکانمان دەنووسین و دەخوێنینەوە.

**سەردێر بۆ گوتار:**

گوتار دەبێ سەردێر، لید، وێنە و کۆمێنتاری هەبێ. لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا، ژانری گوتار لە تەواوی ژانرەکانی دیکە پێشکەوتووترە و کەم هەڵەترە. ئەمەش لەوانەیە، لەبەر ئەوەی زۆربەی نووسینەکانی تەواوی ژمارەکان، گوتار بن، جگە لەوەش، زۆربەی نووسەرەکان بە نووسینی گوتار دەست بە پیشەی ڕۆژنامەنووسی دەکەن. هەر بۆیەش ئەو سەردێرانەی، کە بۆ گوتار دادەندرێن لە زۆربەی نووسینەکانی دیکە باشترن. لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت، ئەوانەی گوتار دەنووسن، بە زۆری کەسانی بەتوانا و خاوەن ئەزمونن، بۆیە لەم ژانرە بوونەتە پسپۆر و کارەکە بەڕێکوپێکی ئەنجام دەدەن.

**"فراوانکردنــی دیموکراســی" "لــەدایکبوونی دەوڵــەتێکی نــوێ" "خــراپ تێگەیشتن لە دیموکراسی[٣٨]"**

**"لەگەڵ خودی خۆماندا پێویستمان بـە دیالۆگـە" "ڕۆژی خۆشەویـستی و کـورد[٣٩]"** سەردێری یەکەم باشە و خوێنەر بـۆلای نووسـینەکە ڕادەکێـشی و زانیارییەك لەسەر ناوەڕۆك دەبەخشی. لە سەردێری دووەم، دیـسان خوێنـەر دەزانێ مەبەست لەم نووسینە چییە، بەڵام بۆ گوتارێك زۆر سـەردێرێکی زەق و گەورەیە. سەردێری سێیەم زیـاتر لـە بەرزکردنـەوەی پرسـیارێکی سیاسـی دەکـات تـا لەباسـکردنی مانـای خۆشەویـستی لـە کوردسـتان. ئـەم جـۆرە سەردێرانە بۆ گوتار زۆر گەورەن، زیاتر بۆ نووسـنی گوتـاری درێـژ بـۆ گۆڤـار یان لەوەش باشتر بۆ ناونیشانی تێزی ماستەر و دکتۆرا چاکن. لەجیاتی ئـەو ناونیشانە، نووسەر دەیتوانی بنووسێ: **"یادکردنـەوەی ڕۆژی خۆشەویـستی لــە نــاو کــورد" "ڤالــەنتاین لــەناو گــەنجانی کــورد لــە کوردســتان" "یادکردنەوەی ڤالەنتاین لە کوردستان" "ڕۆژی ئاشقان"**. ئەو سەردێرانەی من نووسیومە، بۆ ئەوجۆرە گوتارانە دەشێن و خوێنەریش باش تێی دەگات. لە خوێندنەوەی سەردێری لەو جۆرە، خوێنەر دەڵێ: یەك ڕۆژمان هەبوو دوور لە سیاسەت، ئەویشیان لێتێکداین و بۆیاغێکی سیاسییان لێدا. ئەو سـەردێرە زۆر سیاســییە و بــەهیچ شـێوەیەك بـۆ نووسـینی گوتارێـك، کـە بـاس لـە خۆشەویستی دەکات ناشێ و ناگونجێ.

**سەردێر بۆ چاوپێکەوتن:**

لە ژانری چاوپێکەوتن (ئینتـەرڤیو، هەڤپـەیڤین، دیـدار...) باشـترین سـەردێر ئەوەیە، کە ڕسـتەیەك لـە قـسەی قارەمـانی چـاوپێکەوتن بکرێتـە سـەردێر و دابندرێ. لێرە نیشانی دەدات، تۆ بایەخی زۆر بە قارەمـانی چـاوپێکەوتنەکە

دەدەیت و لەلایەکی دیکەش زۆربەی کات ڕستەکان کورتن. **"لەبەر ئەوەی هزری موئەسەساتیمان کەمە، بۆیە هەنگاوی کەممان بۆ ناوە[٤٠]"** ئەمەی سەرەوە قسەی مەحمود محەمەد ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لەکاتی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەی ڕۆژنامە گوتبووی. لە هەمان ڕۆژنامە، بەلأم لاپەڕەیەك دواتر نووسراوە: **"پەکەکە گەلی کوردی تووشی وەستان کردووە"** ئەمە قسەی یاشار کایایە لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ڕۆژنامە گوتوویەتی.

دەشکرێ لە چاوپێکەوتن، تۆ باس لەو تەوەرە بکەیت، کە تۆ چاوپێکەوتنت لەسەری کردووە و ناونیشانی تەوەرەکە یان باسەکە بکەیتە سەردێر، بەلأم لەزۆربەی ڕۆژنامەکانی جیهانیش بۆتە باو، پارچەیەك لە کۆپلەی قارەمانی چاوپێکەوتن وەك سەردێر دادەندرێ.

**سەردێر بۆ ڕۆژنامەی بەیانییان و ئێواران:**

دوو جۆر ڕۆژنامەی کاغەز هەیە و یەکیان بەناوی: **"ڕۆژنامەی بەیانییان"** و ئەوەی دیکەش بەناوی **"ڕۆژنامەی ئێواران"** لە زۆربەی ولأتانی جیهان دەردەچن. ڕۆژنامەی بەیانییان بە فۆرم لە ڕۆژنامەی ئێواران گەورەترە و زۆربەی جار بە قەبارەی بەتاڵ دەردەچێ، ڕۆژنامەی ئێوارانیش بچووکتر و بە قەبارەی تابلۆید دەردەچێ. ڕۆژنامەی بەیانییان لەبەر ئەوەی بەیانییان دەردەچێ، هەموو بەیانییەك لە ولأتانی پێشکەوتوو ئەو کەسەی ئابۆنەی هەیە، کاتژمێر پێنجی بەیانی ڕۆژنامەکەی بەدەست دەگات. ئەو پێش ئەوەی بچێتە سەر کار، کە زۆربەی جار حەوتی بەیانی دەبێ لەسەر کار بێت، لەگەڵ قاوە خواردنەوەی سەیری ڕۆژنامەش دەکات، بۆ ئەوەی بزانێ ئەو شەوە چی

له وڵاتی ئەو و جیهان ڕوویداوە، بۆیە بەلای ئەوانەوە هەواڵ لە ڕۆژنامە زۆر گرنگە.

ڕۆژنامەی بەیانییان، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژنامەی ئێواران سەردێریشیان لە لاپەڕە یەك بچووکترە و لە کەمترین وشە پێکدێت. ڕۆژنامەکانی ئێواران بەردەوام و بەگشتی ستایلی گەورەتریان لە لاپەڕەی یەکەم لە ڕۆژنامەی بەیانییان هەیە، بەڵام ناوەڕۆکیان وەك یەکە[٤١]. لە وڵاتانی پێشکەوتوو جیاوازی زۆر لەنێوان ڕۆژنامەی بەیانییان و ئێواران هەیە و هەر یەکە و خوێنەری خۆی هەیە. ڕۆژنامەی ئێواران زۆربەی کات دوای نیوەڕۆ دەردەچێت و تەواوی هەواڵ و ڕووداوەکانی شەو لەگەڵ بەرەبەیانی تێدا. ڕۆژنامەی ئێواران سەردێری زۆر و نووسینی کەمە[٤٢].

له کوردستان ئێمە جارێ نە ڕۆژنامەی بەیانییانمان هەیە و نە ڕۆژنامەی ئێوارانیشمان هەیە. ڕۆژنامەکانی خەبات و کوردستانی نوێ، لەڕاستیدا ڕۆژنامەی بەیانییانن، بەڵام لەبەر هەندێك گرفتی تەکنیکی و چاپ و چاپخانە لەکاتی خۆی دەرناچێت و زۆربەی ڕۆژ دوای کاتژمێر هەشت دەگەنە دەست خوێنەر. باس لەوە هەرناکرێ، جارێ لە کوردستان ڕۆژنامە بۆ ماڵەکان ناچێ و زیاتر دامودەزگاکان ئابۆنەیان هەیە. لەوانەیە ڕۆژنامەکان کەمێك زووتر تەواو ببن، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵك لەماڵەکان ئابۆنەیان نییە و دامودەزگاش دوای کاتژمێر هەشتی بەیانی دەستبەکار دەبن، درەنگتر دەگاتە دەست خوێنەران، ئەگینا لە کوردستان زۆبەری جار دوا لاپەڕە لە نزیك کاتژمێر ١٢ —تا ١ ی بەیانی دەگاتە چاپخانە. لە وڵاتانی پێشکەوتووش، دوا لاپەڕەکان نزیك کاتژمێر یەکی بەیانی دەگەنە چاپخانەکان.

له کوردستان ئەگەر ڕۆژنامە بەیانیانیش دەربچێ، لەبەر خراپی سیستێمی دابەشکردن و خراپی هاتوچۆ، زۆر درەنگ دەگاتە ناوچەکان. ڕۆژنامەی

خەبات دوای کاتژمێر هەشتی بەیانی زۆربەی جار ١٠ی بەیانی دەگاتە سولەیمانی و دهۆك و زاخۆ و ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ" ش بەهەمان شێوە لەبەر ئەوەی لە سولەیمانی چاپ دەکرێ درەنگتر دەگاتە هەولێر و دهۆك. لە کوردستان گوند و شارە بچووکەکان، لە ڕاگەیاندنی نووسراو تەواو بێبەشن و هیچیان بۆ ناچێ. بۆیە سەیر نییە، لە شارۆچکەیەکی وەك شەقلاوە ڕۆژانە جگە لەئابۆنە، چوار ڕۆژنامەی خەبات یان کوردستانی نوێی لە ساڵی ٢٠٠٥ لێ نەدەفرۆشرا. ئەگەر شارێکی وڵاتی سوید لەگەڵ شەقلاوە بەراورد بکەین، دەبینین دانیشتوانی شاری کارلستاد نزیکەی ٨٠ هەزار کەسە، ڕۆژانە دوو ڕۆژنامەی ڕۆژانەی بەیانییانی هەیە.

**سەردێر لە شێوەی پرسیار:**

نووسینی سەردێر لە شێوەی پرسیار لە ڕۆژنامەکانی کوردی زۆر بڵاوە، بەڵام ئەم شێوە نووسینە لەلایەن نووسەرانی پسپۆری بواری ڕاگەیاندن بەتوندی ڕەت دەکرێتەوە. ئەو سەردێرەی دێتە ناو مێشکت، لەوکاتەی خەریکی کۆکردنەوەی فاکتەکانیت، نابێ ئەو پرسیارە بێت، کە تۆ دەستت بەکارکردنی کردووە. سەردێری پرسیار هیچ ناڵێت[٤٣]. بۆ نموونە تۆ ناتوانی بنووسیت: بەرنامەی وەزیری پەروەردە بۆ خوێندن چییە؟ لەجیاتی ئەوە بنووسە: وەزیری نوێی پەروەردە بایەخی زۆر بە ناردنە دەرەوەی خوێندکاران دەدات. یان لەجیاتی ئایا گەشتە زانستییەکانی کۆلێژی ئاداب بەردەوام دەبێ؟ چاکترە بنووسیت: مامۆستاکان گەشتە زانستییەکانی قوتابییان ڕادەگرن. "ئایا خەڵکی کوردستان پشتیوانی دەستەڵاتی کوردی دەکەن[٤٤]؟"لەجیاتی ئەو شێوە نووسینە زۆر چاکتر دەبوو بنووسرابا: "خەڵکی کوردستان لە پرسە گرنگەکان پشتگیری لە سەرۆك دەکەن" یان،

"خەڵکی کوردستان لە دەستەڵات تووڕەن". چونکە لەو کاتەی تۆ سەردێر لەشێوەی پرسیار دەنووسیت، ڕێك دەکاتە ئەوەی تۆ پرسیار لە خوێنەر دەکەیت. بۆیە هەوڵ مەدە سەردێر لە شێوەی پرسیار بنووسیت، چونکە خەڵك لە بەرزترین دەنگ باشتر تێناگات! ڕۆژنامە نابێ پرسیار لە خەڵك بکات، دەبێ وەڵامی پرسیاری پەیامنێری تێدابێت، کە پێشتر لە قارەمانی خۆی کردووە. لەوکاتە نەبێ، کە پەیامنێر لە نووسینەکەی هەندێك لاوازی پێوە دیارە و هەندێك زانیاری بۆ ڕوون نەبۆتەوە. بەهۆی ئەمجۆرە سەردێرە یانی سەردێر لە شێوەی پرسیار، نووسینەکەی بەهێزتر دەکات.

ئەگەر تۆ ناچار بکرێیت، بەم شێوەیە بنووسیت، لەوکات دەبێ بەهۆی وێنەوە یان لەگەڵ وێنە دابندرێت، کە کاریگەری زۆر دەبێ و لەگەڵ خوێنەر پەیوەندی دروست دەکات. لەگەڵ ئەوەش نیشانەی پرسیار دەبێ زۆر بەهۆشیاری مامەڵەی لەگەڵ بکرێ و بەکار بهێندرێ[٤٥]. هەمان بۆچوونی سەرەوە لەلایەن ڕۆژنامەنووسی سویدی Rune Pettersson پەسند دەکرێ. پیاو دەتوانی نیشانەی پرسیار لە سەردێر دابنێ، چونکە بۆ نووسینەکە زۆر گرنگن. بەڵام خال و هێڵ داناندرێ[٤٦].

**سەردێر لە ڕۆژنامە کوردییەکان:**

ئەو کەسەی سەردێر دەنووسێ، دەبێ زۆر باش بزانێ بۆچی ئەو بەو شێوە نووسیویەتی ڕازییە و نایەوێ بیگۆڕێ. ئەگەر ئەو کەسەی لەڕۆژنامە کاری سەردێر نووسینە، دەبێ تەواوی نووسینەکە زۆر بە وردی بخوێنێتەوە و ئینجا یەك سەردێری بۆ دابنێ.

لە راستیدا چەند بایەخ بە نووسینەکە دەدرێ، باشە ئەوەندەش بایەخ بە سەردێر بدرێ، چونکە ئەگەر سەردێرەکە باش نەبێ، دیارە نووسینەکە هیچ مانای نابێت و بەمەش تۆ نەتتوانیوە پەیامت بە خوێنەران بگەیێنیت.

واچاكە سەردێر لە شەش وشە زیاتر نەبێ، بەڵام لە ڕۆژنامە كوردییەكان و لە زۆربەی نووسینەكان ئەو پێوەرە پەیڕەو نەكراوە. **"وێڵبوون بەدوای خەونێكی بێ پلان و لە بارودۆخێك مانای دەستكەوتنی بەختەوەری نییە ئەگەر نابەختەوەر بوویت و راتكرد، دڵنیابە بۆ هەر شوێنێك بڕۆیت لەگەڵ خۆتدا ئەو نابەختەوەرییە دەبەیت [٤٧]"**

**"فەلاح مستەفا: سەرۆكی حكوومەتی كوردستان جەختی لەوە كردەوە كە ئێمە دەمانەوێ سوود لە ئەزموونی دەوڵەمەندی كۆریای باشوور وەربگرین**

**ئەوەی تا ئێستا حكوومەتی كوردستان كردوویەتی لە چوارچێوەی یاساو مافە دەستووریەكانمان بووە**[٤٨].

بەگوێرەی خوێندنەوەی ڕۆژنامە كوردییەكان، دیارە پەلەكردنێك یان نەزانینێك لە نووسینی سەردێردا هەیە. تا ئێستا بەچەند جۆرێك دەنووسن و ئەوانەی دیكەیان زۆر پشتگوێ خستووە. ئەوان بۆ هەواڵ سەردێری درێژ دەنووسن، ئەمەش تەواو لەگەڵ نووسین و دانانی سەردێر ناگونجێ.

**"كوردێك بەدەست باڵوێزخانەی عێراقەوە لە لەندەن، دوچاری نەخۆشی دەروونی دەبێت**[٤٩]**"** ئەمەی سەرەوە جگە لەوەی لە ١١ وشە پێكهاتووە، یەك فاریزەش بۆ ئەو سەردێرە داندراوە، لەكاتێكدا لە نووسینی سەردێر باش نییە فاریزە یان نوقتەی هەبێ.

سەردێرێك بەناوی: **"گەنج و كۆمەڵگا و ئاینده"** لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ڕۆژی ١٨ – ٢ – ٢٠٠٨ نووسراوە. ئەم سەردێرە لەراستیدا زیاتر بۆ ناونیشانی گوتاری زانستی یان نامەی ماستەر و دكتۆرا یان كتێب دەگونجێ لەوەی ٣/١ ی لاپەڕەی ڕۆژنامەی پێبدرێ.

سەردێر دەبێ کڵاوی نووسینەکە بێت، ئەمەش دەکاتە ئەوەی کە سەردێر نابێ وردەکارییەکانی گوتارەکەی تێدا بێت، کە وا لەخوێنەر بکات، پێویست بە خوێندنەوەی گوتارەکە نەکات. بەڵکو ئەو دەبێ لە ئەنجامی خوێندنەوە وردەکارییەکانی بۆ ڕوون بێتەوە، چونکە ئەمە ڕاستە، کە زۆربەی خوێنەران تەنیا سەردێر دەخوێننەوە و زۆر کەمتریش گوتارەکە دەخوێننەوە. لە سەردێر دەبێ ئاماژە بە گرنگترین باسی گوتارەکە بکرێت.

سەردێر نابێ هەندێك وشەی توند یان گەرم بەکار بهێندرێ بۆ نموونە: **"پەنجەی خۆی بڕی بۆ ئەوەی یەك ملیۆن وەربگرێ(٥٠)"** بەڵام ئەم جۆرە نووسینە یان پرەنسیپە لە ڕۆژنامەکانی کوردی بەهیچ شێوەیەك یان زۆر بەکەمی پەیڕەو دەرکرێ. **"کچێکی ٨ ساڵان هەردوو چاوی دەردەهێندرێن و بەتەورداس دەکوژرێ[٥١]"** **"لە هەفتەیەکدا ٧ ژن دەکوژرێن و ٥ ی دیکەش دەسووتێن و ژنێکیش خۆی دەکوژێت[٥٢]"** **"هەفتەی ژنکوژی لە کوردستان[٥٣]" کێ لە مەرگ و ژیانی ئەم کۆمەڵگەیە بەرپرسە[٥٤]؟!"** **"پیاوێك بە چەقۆ لەلایەن خاڵیەوە دەکوژرێت[٥٥]"** **"دابەشبوون یان خوێنبەربوونی بەردەوام[٥٦]"** **"خواردن و توندوتیژی[٥٧]"** **"ئەفریقا و دیموکراسیەتی فیشەك[٥٨]"**

ئەو جۆرەی ئێستا نووسینی پێدەکرێ مەرج نییە، گۆڕانکاری بەسەر دانەیەت و لەداهاتووش بەهەمان شێوە پەیڕەو بکرێ. نووسینی سەردێریش لە ڕۆژنامەکانی کوردی، وەك لە ڕۆژنامەکانی ئەورووپی گۆڕانکاری تێدەکرێت و لە داهاتوو بەو شێوە دەنووسرێ، تا زۆرترین خوێنەر لەخۆی کۆکاتەوە.

سەردێر لە ڕۆژنامەکانی سویدی پێش چەند ساڵێك ئاسایی بوو، ئەگەر لەچەند دێرێك پێکهاتبا، یەك سەردێر لە ١٠ دێر پێك دەهات، ئێستا زۆربەی سەردێرەکان ٢–٣ دێرن[٥٩]. هەندێك لەو دێرانە تەنیا یەك وشە بوون.

لەسەردێردا دەبێ، هەوڵبدرێ وشەی کورتکراوە زۆر بەکار نەهێندرێ، تەنیا لەو کاتانە نەبێ، کە وشەکان لەلایەن تەواوی خەڵك ئاشکرا و ڕوونە و دەناسرێتەوە[٦٠]. دانانی سەردێر لە ڕۆژنامە گەورەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو، سوێد بەنموونە، ڕۆژنامەنووس نایننووسێ، بەڵکو موحەریرەکان دەینووسن. ئەوان لەبەر ئەوەی تەواوی بابەتەکانی لاپەڕەکەیان لایە، دەزانن چەند شوێنیش بۆ ئەو سەردێرە هەیە و زۆربەی جار بەگوێرەی ڕووبەری لاپەڕە ژمارەی وشەی بۆ دادەندرێ. سەردێر لەو شوێنەی بۆی داندراوە دەبێ جێگای ببێتەوە. ڕۆژنامە قەبارەی خۆی دیارە و بەشێکیشی بۆ سەردێر تەرخان دەکرێ. سەردێر دەبێ دیاربێ و سەرنجی خوێنەر بۆلای خۆی ڕابکێشێ. بۆ ئەمەش دەبێ زۆر گەورە بێ. ئەوەش دەکاتە ئەوەی، کە زمان کاریگەری خۆی دەبێت[٦١].

زۆر لە دەستەی نووسەران چەندین کاغەز فڕە دەدەن، تا سەردێرێکی ڕاست و دروستیان وەگیر دەکەوێ. پاش نووسینی بیرۆکەی یەکەم، هەندێك جار تەنیا یەك وشە دەگۆڕدرێ.

لەکاتی دانانی سەردێر نابێ لەیەك لاپەڕە بەچەند جۆرە فۆنتێك بنووسرێ، بەڵکو لە تەواوی ڕۆژنامە لە ٣ – ٤ جۆری فۆنت زیاتر ڕەوا نییە بۆ لاپەڕە و ڕۆژنامە دابندرێ، چونکە ئەگەر ئەو ستاندارتە پەیڕەو نەکرێ، لەوانەیە ڕۆژنامەکە بینینی زۆر بێزارکەر بێت. بە قسەی پاشای نەخشەسازی ڕۆژنامە ماریۆ گارسیا ڕۆژنامەیەکی باش دەبێت: بچووك بێت، جوان بێت، خوێندنەوەی ئاسان و خۆش بێت. ڕۆژنامە بەهیچ شێوەیەك نابێت،

سەیرکردنی بێزارکەر بێت. ئەو دەڵێ سێ شت هەن، بەردەوام خەباتیان بۆ دەکەم، پیتەکان دەبێت گەورە بن، بۆ ئەوەی بەئاسانی بخوێندرێنەوە، دابەشبوونی نووسینەکان ڕێکوپێك بێت، تاکو ئەوەی بەدوای دەگەڕێت، بەئاسانی بیدۆزێتەوە[٦٢]. لە پرسیاری باشترین سەردێر چییە؟ دەڵێین ئەو سەردێرەیە، کە زۆرترین خوێنەر بۆ نووسینەکە پەیدا دەکات. ئەوەش تەنیا تۆ وەك خوێنەر دەتوانی بڕیاری لەسەر بدەیت[٦٣].

هەموو نووسینێك لە ڕۆژنامە و گۆڤار ناوێکیان هەیە و ئەو ناوەش سەردێری پێدەڵێن. لەوکاتەی خوێنەر پەیوەندی بە ڕۆژنامە دەکات، بۆ ئەوەی کارمەندانی ڕۆژنامە لەمەبەستی بگەن، ئەو ناچار دەبێ ناوی سەردێری گوتار، ڕێپۆرتاژ، هەواڵ...هتد بهێنێ. سەردێر دەکاتە ناوی نووسینەکە و بەهۆی ئەوەوە نووسینەکان دەناسرێنەوە. "ئەوان گوتاریان خوێندۆتەوە، بەڵام خوێندنەوەکە بەشێوەی ڤیسوێل (بەچاو سەیرکردن) وێنە و سەردێر و نووسینەکان بەیەکەوە بووە". بۆ ئەوەی نووسین بخوێندرێتەوە دەبێ جگە لە سەردێری باش، وێنە و کۆمێنتاری ژێر وێنەش هەبێ. کۆمێنتاری باش تەنیا زانیاری لەسەر ناوەڕۆکی وێنەکە نادات، بەڵکو یارمەتی سەردێر و لید دەدا، باشتر لە نووسینەکە بگەن[٦٤]. ئێمە نابێ کۆمێنتار تەنیا لەژێر وێنە بنووسین، لە ژێر وێنەی پۆرترێت.

## ئەنجام:

ئەو ئازادییەی لە کوردستان هەیە، ڕاگەیاندنی کوردی توانیویەتی، زۆر بە باشی سوودی لێ وەربگرێ. حکومەتی هەرێم لەگەڵ هەموو حیزبە سیاسییەکانی کوردستان، خاوەنی ڕۆژنامە، گۆڤار، ئێزگەی ڕادیۆی خۆیانن. ئەو زۆرییە، بۆتە دروستکردنی پێشبڕکێیەکی گەورە لە نێوان تەواوی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کە لەئەنجامدا، زۆربەی دانیشتوانی کوردستان سوودمەند بوون.

جەماوەری کوردستان، ئەمڕۆ زۆرتر لە پێشان، مەرجی بۆ ڕاگەیاندن داناوە، بەوەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، فراوانترین زانیاری بە خوێنەران بدەن، دانانی ئەو مەرجانەی سەرەوەیە، کەسانێکی ناچار کردووە، وەك پێشان، نەتوانن ڕاستییەکان لە جەماوەر بشارنەوە یان خەفەی بکەن.

لە بازاڕی کتێبی کوردیدا، سەرچاوەی زۆر لەسەر ڕاگەیاندن پەیدا بووە، بەڵام زۆر بەدەگمەن، لەوان باس لە گرفتەکانی ڕاگەیاندنی کوردی ئەمڕۆ دەکات. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لەسەر "سەردێر" گەیشتینە ئەوەی، ئەو کەسانەی سەردێر بۆ نووسینەکانیان دادەنێن، زۆربەی جار، لەبەر هەڵبژاردنی سەردێری خراپ یان زۆر زەق، خەڵك نووسینەکە ناخوێننەوە، ئەگەر بشی خوێننەوە، پاش تەواوبوونی بریندار دەبن و پەشیمانن لەوەی، کە ئەو کاتەیان بۆ خوێندنەوەی تەرخان کرد، بۆیە هەست دەکەن فێڵیان لێ کراوە. دیارە لەو جۆرە نووسینانە، ئەخلاقی ڕاگەیاندن بیری لێ نەکراوەتەوە. زۆربەی ئەو سەردێرانەی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانیش دادەندرێن، تا ئێستا لە ئاستی پێویست نین.

## پەراوێزەکان

١- سەپان مەغدید، دکتۆر. ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە (١٤٥٠-١٥٠٠). هەولێر، ٢٠٠٥ .- ل. ١١٢

2- Björn Nöljer، Så snickar du en tidningsartikel. Borås، 1994.- p.16

3- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p.46

٤- سەپان مەغدید، دکتۆر. ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە (١٤٥٠-١٥٠٠). هەولێر، ٢٠٠٥ .- ل. ١١٨

5- Rune pettersson. Rubriker. Nyköping، 2003 –p. 25

6- Söran Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 168.

7- Rune pettersson. Rubriker. Nyköping، 2003 –p. 7

٨- بۆ نووسینی ئەم توێژینەوەیە ئەم ڕۆژنامانەی خوارەوەم لەبەر دەست بوون: ڕۆژنامەی خەبات ڕۆژانی: ١٤، ١٥، ١٦- ٢ - ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ڕۆژانی: ١٤، ١٩، ٢٠ - ٢ - ٢٠٠٨، هەفتەنامەی میدیا ڕۆژی: ١٢ - ٢- ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی جەماوەر ڕۆژی: ٧ -١ - ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی هاوڵاتی ڕۆژانی:١٧ - ١٠ لەگەڵ ٢٨ - ١١ - ٢٠٠٧، ڕۆژنامەی ئاوێنە ڕۆژی: ١٢ - ٢ - ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی "ڕۆژنامە" ڕۆژانی: ١٢، ١٣، ١٨، ٢٠ - ٢ - ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی هەولێر ڕۆژانی: ١٣، ١٩ - ٢- ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی هەواڵ ڕۆژی: ١٦ - ٢ - ٢٠٠٨، ڕۆژنامەی کوردستان ڕاپۆرت ڕۆژی: ١ - ١٢ - ٢٠٠٧ ڕۆژنامەی بارزان ڕۆژی: ١٧ - ٢ - ٢٠٠٨ لەگەڵ ڕۆژنامەی ئاسۆ ڕۆژی: ٩ - ١٠ - ٢٠٠٧، هیچ لەو ژمارانەی سەرەوە سەردێری مقەسییان بەکار نەهێناوە.

9- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p.50

١٠- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ل. ١، ٢٠ - ٢ - ٢٠٠٨

١١- ڕۆژنامەی هەولێر. ل. ١، ١٩ - فێبریوەری ٢٠٠٨

١٢- هەفتەنامەی میدیا. ل. ١، ١٢ - ٢ - ٢٠٠٨

١٣- ڕۆژنامەی ڕۆژنامە. ل.١، ١٢ - ٢ -٢٠٠٨

١٤- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ل. ١، ٢٠ - ٢ - ٢٠٠٨

١٥- هەفتەنامەی میدیا. ل. ١٨، ١٢ - ٢ - ٢٠٠٨

16- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p.50

١٧- ڕۆژنامەی هاوڵاتی. ل. ١، ١٧ - ١٠ -٢٠٠٧

١٨- ڕۆژنامەی ئاوێنە. ل.١، ١٢ - ٢- ٢٠٠٨

١٩- ڕۆژنامەی بارزان. ل.١، ١٧ - ٢- ٢٠٠٨

٢٠- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ل.١٢، ١٩ - ٢ - ٢٠٠٨

٢١- هەفتەنامەی میدیا. ل. ١، ١٢ - ٢ - ٢٠٠٨

22- Söran Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 168.

٢٣- ڕۆژنامەی هەواڵ. ل.٤، ١٦ - ٢ - ٢٠٠٨

٢٤- ڕۆژنامەی خەبات. ل. ٣، ١٦ - ٢ - ٢٠٠٨

25- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p.50

٢٦- ڕۆژنامەی خەبات. ل. ١، ١٤ - ٢- ٢٠٠٨

٢٧- ڕۆژنامەی خەبات. ل. ١٦ - ٢ - ٢٠٠٨

28- Söran Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 161.

٢٩- ڕۆژنامەی جەماوەر. ل. ١، ٧ - ١ - ٢٠٠٨

٣٠- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ل. ٢، ٢٠ - ٢ - ٢٠٠٨

٣١- ڕۆژنامەی ڕۆژنامە. ل. ٢، ١٢ - ٢ - ٢٠٠٨

٣٢- ڕۆژنامەی جەماوەر. ل.٧، ٧ - ١ - ٢٠٠٨

33- Rune pettersson. Rubriker. Nyköping، 2003 –p. 12

٣٤- ڕۆژنامەی هاوڵاتی. ل. ٦ - ٧ / ١٠ - ٢٠٠٧

٣٥- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ل. ١، ٢٠- ٢ - ٢٠٠٨

٣٦- هەفتەنامەی میدیا. ل.٢، ١٢ - ٢ - ٢٠٠٨

٣٧- ڕۆژنامەی جەماوەر. ل.٢، ٧ - ١ - ٢٠٠٨

٣٨- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ل. ٦ - ٧ / ٢ - ٢٠٠٨

٣٩- ڕۆژنامەی خەبات. ل. ٥، ١٤ - ٢ - ٢٠٠٨

٤٠- ڕۆژنامەی ڕۆژنامە. ل. ٥، ١٨ - ٢ - ٢٠٠٨

41- Söran Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 165.

٤٣42- Rune pettersson. Rubriker. Nyköping، 2003 –p. 9
43- Sören Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 162.

٤٤- ڕۆژنامەی ڕۆژنامە. ل.٥، ١٨ – ٢- ٢٠٠٨

45- Sören Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –pp. 48-58.
46- Rune pettersson. Rubriker. Nyköping، 2003 –p. 24

٤٧- ڕۆژنامەی هاوڵاتی. ل. ١٠، ٢٨ – ١١ – ٢٠٠٧

٤٨- ڕۆژنامەی خەبات. ل.٣، ١٥ – ٢ – ٢٠٠٨

٤٩- ڕۆژنامەی جەماوەر. ل. ٢، ٧ – ١- ٢٠٠٨

50- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p. 47

٥١- هەفتەنامەی میدیا. ل. ١، ٤ – ١٢ – ٢٠٠٧

٥٢- هەفتەنامەی میدیا. ل. ١، ١٢ – ٢ – ٢٠٠٨

٥٣- هەمان سەرچاوەی پێشتر ل. ١٣،

٥٤- ڕۆژنامەی هەواڵ. ل. ٨، ١٦ – ٢- ٢٠٠٨

٥٥- ڕۆژنامەی ئاوێنە. ل. ١٦، ١٢ – ٢ – ٢٠٠٨

٥٦- ڕۆژنامەی هاوڵاتی. ل. ١٣، ١٧ – ١٠ – ٢٠٠٧

٥٧- ڕۆژنامەی هاوڵاتی. ل. ١٢، ١٧ – ١٠ – ٢٠٠٧

٥٨- ڕۆژنامەی خەبات. ل. ١٣، ١٥ – ٢ – ٢٠٠٨

.59- Sören Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 165

60- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p. 48

٦١- هەمان سەرچاوەی پێشتر.ل. ٤٩

٦٢- ڕۆژنامەی ێتەبۆری پۆستن . ل.٣٤. ١٧ – تەموزی ٢٠٠١ (بەزمانی سوێدی)

63- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998. – p. 58
64- Sören Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985 –p. 174

## سەرچاوە لەگەڵ ئەو کتێبانەی

## بۆ ئەم توێژینەوەی سوودم لێ وەرگرتوون


**بەزمانی سوێدی:**

1- Björn Nöljer. Så snickar du en tidningsartikel. Borås، 1994

2- Catharina Grunbaum. Språkbladet. Borås، 1998

3- Fredric Bagge. Grafisk industri. Stockholm، 1940

4- Göran Rosenberg. Journalstik. Prisma،. 2000

5- Jarl Backman. Att skriva och läsa vetenskapliga rapporter. Lund، 1985

6- Lars J Hulten. Journalistikens villkor. Borås، 1993

7- Maria-Pia Boethuius. Mediernas svarta bok. Falun، 2001

8- Marshall McLuban. Media. Falun، 1999

9- Rune pettersson. Rubriker. Nyköping، 2003

10- Stig Hadenius، Lennart Weibull. Massmedier. Falun، 2003

11- Sören Larsson. Att skriva i tidning. Stockholm، 1985

12- Åke Edwardson، Kenth Andreasson، per andersson-Ek. Göra tidning. Värnamo، 1998

**بەزمانی رووسی:**

1- Ворошилов В. В. Журналистика. СПб.، 1999

2- Головня И. А. С чего начиналась фотография. М.، 1991

3- Гуревич С. М. Номер газеты. М.، 2002.

4- Засорина Т، Федосова Н. Профессия – журналист. Ростов н/д; 1999

5- Корконосенко С. Г. Основы творческой деятелъности журналиста. СПб.، 2000

6- Лазутина Г. В. Профессионалъная этика журналиста. М.، 1999

7- Лазутина Г. В. Основы творческой деятельности журналиста. М.، 2000

8- Мельник Г. С. Mass-media: Психологические процессы и эффекты.СПб.،- 1996

9- Михайлов С. А. Журналистика стран северной европы. СПб.، 2003
10- Накорякова К. М. Литературное редактирование. М.، 1994
11- Самолетов С. А. Дизайн современной газеты. СПб.، 1998
12- Сапан М. Печать курдской диаспоры: история и современное состояние. СПб.، 1998

### بەزمانی کوردی:

١- سەپان مەغدید، دکتۆر. ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە (١٤٥٠-١٥٠٠).
کۆڕی زانیاری کوردستان- هەولێر، ٢٠٠٥
٢- سەپان مەغدید، دکتۆر. ئاژانسەکانی دەنگوباس. ئاراس - هەولێر، ٢٠٠٦
٣- سەپان مەغدید، دکتۆر. ئەگەر ڕۆژنامەنووس هات. سەردەم- سولەیمانی، ٢٠٠٧

### ڕۆژنامە بە زمانی سوێدی:

ئیلڤە ماندرسۆن. ڕۆژنامەی یتەبۆری پۆستن، ١٧ - تەموزی ٢٠٠١، ل. ٣٤.

ملخص البحث

# وضع وكتابة المانشيت في الصحف والمجلات الكردية

**د. مغديد خضر أحمد سەپان**

جامعة صلاح الدين –أربيل/ كلية الاداب – قسم الاعلام


لاشك أن ظاهرة التعددية الحزبية في كردستان قد ساهمت في ترسيخ مفهوم المجتمع التعددي وتطوره القائم على المساواة والديمقراطية، بمعنى آخر لا وجود للديمقراطية في المجتمعات دون وجود صحافة حرة.

ويجب القول، بأن كردستان قد شهدت تطورا ملموسا في مجال النشر والاعلام بسبب توفر الارضية الديمقراطية المناسبة والحرية الكاملة. الا أن المشكلة هنا تكمن في أن عدد الصحف والمجلات تزيد عن عدد الكوادر والمختصين فى هذا المجال.

ان احدى العوائق التي تعاني منها الصحافة الكردية لاسيما من الناحية الفنية والتي بدورها تعيق عملية تطور الاعلام هي مسألة كيفية وضع المانشيت في الصحف والمجلات وترتيبها.

ان بحثنا هذا يهدف الى ملأ الفراغ الذي تعاني منه الاعلام الكردي وكاسهام متواضع منا في ازالة هذة العوائق والاشكاليات وايجاد حلول مناسبة لها.

نرى بأن موضوعنا يشكل اهمية بالغة في هذه المرحلة التي يصدر فيها عشرات الصحف والمجلات، حيث تشهد كردستان نهضة ثقافية واسعة جدا، لارتقأ الصحافة الكردية الى مستوى ارقى.

لقد اعتمدت خلال كتابة بحثي على مجموعة من المصادر المتنوعة والمهمة برأينا الصادرة باللغات الروسية، والسويدية والكردية وقد استقينا الامثلة المستخدمة في هذا البحث من الصحف والمجلات الكردية.

واخيرا نأمل أن أكون قد ساهمت ولو جزئيا في ايجاد حلول لهذه المسألة الحيوية في مجال الصحافة والاعلام الكرديين.

<u>ABSTRACT</u>

# Headline & Writing in Kurdish journalism

**Dr.Magded Khidir Ahmad Sapan**
**College of Arts – Media Deparment،**
**Salahaddin University - Erbil**

The multi – party system in Kurdistan establishes and supports an equal and democratic society. It is impossible to have democracy without having the freedom of press، not only in Kurdistan، but all over the world. Due to the existence of a relative freedom، Kurdish journalism is developing very fast. Since there is a large number of newspapers and magazines publishing today in Kurdistan، with a small number of cadres and specialists، Kurdish journalism is facing a number of problems، one of these problems is headline writing.
This paper is entitled "Headline writing in Kurdish journalism". It aims at improving the quality of headline writing، or at least، to pave the way for other media specialists to research on this issue.
This paper is important، because it deals with an essential issue immediately، since most of the headlines in Kurdish newspapers and magazines could not attract the reader's attention. The objective of this paper is to serve Kurdish journalism. So that، in the future Kurdish journalism can write proper headlines that reflect the contents of their writings.We hope that we can bring the Kurdish journalism closer to professionalism and academy. The paper makes use of several important references written in Russian، Swedish and Kurdish. The data are taken from Kurdish newspapers and magazines.

# تیـــاریـــیەکانی دۆڵـــی نـەهـلـــێ

## (لێکۆڵینەوەیێکی مەیدانی)

**د. عەبدوڵڵا غەفوور**

**زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر/ کۆلێژی ئاداب / بەشی جوگرافیا**

**بەرایی**

شوباتی ساڵی دوو هەزار و هەشت لە سەردانی خوێندکارێکی قۆنـاغی دووەمـی بەشی جوگرافیا لە کۆلێژی ئاداب، خەڵکی گونـدی سـیان تتـو سـەر بـە ناحیـەی نەهلێ لە قەزای ئاکرێ، بووم. ئەو رۆژەی لـە گونـدی بامـشمش بـووین، تووشـی پیاوێکی تیاری بە ناوی قیصر، خەڵکی گوندی کەشکاوا، هاتم. ئارەزووی سەردانم کرد ئەویش بە خۆشحاڵییەوە مێوانداریێتی خۆی دەربڕی. هەڵبەتە خۆم بە قەرزاری ئەو پیاوە و خێزانەکەی، دەزانم.

لێکۆڵینەوەکەم، کە لە لاپەڕەکانی بێ دەیانخەمە بەر چاو، ئەنجامی دوو سەردانە: یەکەمیان لە بیست و پێنجی مارت (دوو رۆژ و دوو شەوم پێ چوو) و دووەمیان لە پێنجی کانوونی یەکەم (دوو رۆژ و دوو شەوی خایەند)، ساڵی دوو هەزار و هەشت، بۆ گوندی تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ.

پێش ئەوەی سەردانی کەشکاوا بکەم، بـۆ ئـەوەی بـە چـاوی گومانـەوە سـەیری کارەکەم نەکرێت و لە پرسیاری لابەلا دوور بم. بە باشم زانی، بەڕێوەبەری ناحیـەی نەهلێ (سەربەست صبری)، لە کارەکەم ئاگادار بکەمەوە. بەڕێزیان، بە نامـەیێکی تایبەت، موختاری گوندی کەشکاوای لە کارەکەم و یارمەتیدانم، ئاگادار کـردەوە.

وەلێ لە سەردانی دووەممدا، لەبەر ئەوەی لای هەندێك لە خەڵكی گوند ناسرابووم، بە پێویستم نەزانی، لەوەی لە سەردانی یەکەم کردبووم، دووبارەی کەمەوە.

## مەبەستی لێکۆڵینەوە

دانیشتوانی باشووری کوردستان، لە رووی پێکهاتەی نەتەوە و ئاینەوە زۆر لێك جودان. لەم وڵاتە کورد و تورکمان و عارەب و کلدان و ئاشووری و هیدیکە دەژین. ئاینی هەندێك لەم نەتەوانە ئیسلامە و هی هەندێکیشیان مەسیحییە. لە پاڵ ئەوانەش ئاینی دیکە، بە نموونە ئێزدی و سابئە و هیدیکەش هەن.

لەم لێکۆڵینەوەم باسی مەسیحییەکان دەکەم. بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە کەنیسەی رۆژهەڵاتی کۆن (الكنيسة الشرقية القديمة) ن. واتە ئەوانەی پێیان دەگوترێ ئاشووری (ئاسووری)، لە ناو ئەمانەشدا ـ تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ.

لێکۆڵینەوەکەم لە چوارچێوەی ئەتنۆ ـ جوگرافیاوە، واتە شتێکی تێکەڵاو لە نێوان ئەتنۆگرافیا و جوگرافیادا کردووە. مەبەستیشم لەمە دانی نەخشەیێکی ڕاست و دروست، لەسەر بەشێك لە دانیشتوانی، باشووری کوردستان.

## گرفتەکانی لێکۆڵینەوە

ئەم کارەی بەردەست وەکو هەر لێکۆڵینەوەیەکی دیکە، لەسەر دانیشتوانی باشووری کوردستان، گرفتی خۆی هەبوو. ئەوانەی خوارەوە، هەندێك لەو گرفتانەن، کە لە کاتی کۆکردنەوەی زانیاریی لەسەر ناوچەکە، تووشی لێکۆڵەوەر هاتوون.

١) کۆکردنەوەی زانیارییەکان بە جارێك و دووان، تەواو نابن. کەوابێ سەردان لەسەر سەردان دەبی بکرێت. ئەوەش، لەبەر ئیشی زانکۆ، هەموو دەم بۆم ڕێك نەدەکەوت.

٢) نێوچەکە لەبەر ئەوەی لا چەپە، هاتوچۆی کەم لەسەرە، کەوابی چوون و هاتن ئاسن نییە. بە نموونە، بۆ ئەوەی بچیتە نێوچەکە دەبێ بەیانی بچیتە ئاکرێ و لە چوار ڕیانی ئاکرێ دابەزیت و چاوەڕێی ئوتۆمۆبێلێك بیت کە بۆ ئەم لایە دەچێت

٣) ئوتۆمۆبیلی خۆم نەبوو بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆم هاتوچۆی پێ بکەم. لەبەر ئەوە، دەبوایە بە پێ گوندەکان بکەم.

٤) نەبوونی پشتگیری ماددی لە لایەن دەوڵەت و زانکۆ و کەسێکەوە. لەبەر ئەوە گشت خەرجییەکان لە ئەستۆی خۆم بووە.

٥) نەبوونی هیچ شتێکی نووسراو لەسەر نێوچەکە. کەوابێ ئەوانەی لەم لێکۆڵینەوە کراون، هەموویان تازەن.

لێکۆڵینەوەکەم لە چوار بەش پێکهاتووە. بەشی یەکەم باس لە بنەمای جوگرافی نێوچەکە دەکات. بەشی دووەم بۆ بنەمای ئابووری تەرخان کراوە. بەشی سێیەم بۆ شیکردنەوەی بنەمای کۆمەڵایەتی جودا کراوەتەوە. بەشی چوارم تایبەتە بە بنەمای سیاسی. بە سەرچاوە و تێبینی تەواو دەبێت.

### بەشی یەکەم
### بنەمای جوگرافی ناوچەی لێکۆڵینەوە
### دەستنیشانکردنی ناوچەی لێکۆڵینەوە

ناوچەی لێکۆڵینەوە، وەکو لە نەخشەی نمرە ١ دەردەکەوێ، کەوتووتە ڕۆژئاوای ناحیەی نەهلێ سەر بە قەزای ئاکرێ و ڕۆژهەڵاتی ناحیەی چەمانکێ سەر بە قەزای ئامێدی. هەردوو قەزا لە چوارچێوەی سنووری ئیداری ئەستانی دهۆك دان.

گوندەکانی تیارییان، وەکو لە نەخشەی نمرە ٢ شوێنیان دیاری کراوە، ئەمانەن : کەشکاوا ـ سەر بە ناحیەی نەهلێ یە ژولێ و خەلیلان و هیزانکێ و هیزانێ بن تاتێ و بلمەنت (بە کوردی بلمەندێ) و ڕەبەتکێ (بە کوردی چەم ڕەبەتکێ) میرۆکێ. سەر

به ناحیەی چەمانکێ نە. واتە کۆی گوندەکانی لە دۆڵی نەهلێ هەشت گونـدە جگـە لەو گوندانەی سەرەوە، تیارییەکان لە گوندەکانی ئەمبەقرێ و شەرەفیە و داشقوتان و کەرەنجۆ (ناحیەی ئەلقۆش ـ قەزای تلکێف) و پیروزاوا (ناحیەی مەرکەز ـ قەزای شێخان) و بابلۆ (ناحیەی زاویتە ـ قەزای دهۆك) و شارەکانی وەکو موسڵ و دهۆك و ئاکرێ و شوێنی دیکە دەژین.




**نیشتەجێبوونی تیارییەکان لە دۆڵی نەهلێ**

تیارییەکان، لەگەڵ نەتەوەی کورد و کلدان و ئەرمەن ئینجا تورك و فـارس و عـارەب، لـە بنەڕەتدا، خەڵکی کوردستانن. تاکو تەواو بوونی جـەنگی یەکـەمی جیهـان لـە نێوچـەی هەکاری (١) دەژیـان. تیارییـەکان بـە ئـاواتی دروسـتکردنی دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ لـە نێوچەکەدا و هێنانی ئەو نێوچانەی کە تیارییان تێدا دەژیان، بە نموونە، نێوچەی ورمێ، بـۆ ژێر رکێفی ئەو دەوڵەتەی بە تەمابوون، دروستی بکەن، پشتیان بە ئینگلیز دا و پشتیان لە

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کرد. ئینگلیزیش بەو شێوەی لە بەرژەوەندی سیاسی خۆی دابــوو، بۆ شکستهێنان بە سوپای ئەم ئیمپراتۆریەتە، شەڕی پێکردن. جەنگ بە قازانجی ئینگلیز و هاوپەیمانان و تێکچوونی ئەم ئیمپراتۆریەتە و بەزینی ئــەڵمانیا تــەواو بــوو. وەلــێ ئــاواتی تیارییەکان نەهاتە دی و گەڕانەوەشیان بۆ شوێنی بەر لە جــەنگ، بــە تونــدنی لــە لایــەن تورکیا ڕەت کرایەوە.

تیارییەکان، دوای تێکەوتنیان، بە یارمەتی ئینگلیز لە ئێران (ناوچەی هەمــەدان)، بۆ ماوەییێك، نیشتەجێ کران. دواتر، بۆ عیراق (ناوچەی بەعقوبە)، گووســترانەوە و چەند ساڵیان لەم شوێنە بەسەربرد. وەلێ کێشەی نیشەجێکردنیان بــە یــەکجارەکی لە شوێنێکدا، لە سەرەتاوە بۆ ئینگلیز و دواتر بۆ عیراق بــە خــۆوە خــەریك کــرد. ئاخرەکەی، لەو شوێنانەی ئێستایان و بێ ڕەزامەندی خەڵکی نێوچەکە، نیــشتەجێ کران و زەوی و زاری (مەرعای گوندەکان) یان لەسەر تاپۆ کرا و لەو ساوە بوون بــە بەشێك لە دانیشتوانی ئەمڕۆکەی باشووری کوردستان.



## جوگرافیای ناوچەی تیارییەکان

ناوچەی تیارییەکان ناوچەییێکی شاخاوی بەرزە لە باکووردا، چیایەکانی تانا و سەری ستانێ و گارە (ئەم چیایە لە سوارەتووکە دەست پێ دەکات و بە چیای پێرس، تەواو دەبێت) لە باشووردا نزاری باکرمان (چیای باکرمان). رۆژهەلاتی نێوچەکە بە گشتی زوورگە و پڕیەتی لە کەند و لەند. وەلێ چەند بەرەو رۆژئاوا بڕۆین بەرزاییەکان روو لە نزمی دەکەن و لە هەندێ شوێن، بە نموونە، دەشتی کەشکاوا، مەیلەو تەختە و ئەگەر لە رووباری خازر بەرەو خەلیلان و هیزان بپەڕینەوە، زەوی تاکو دێ تەختتر دەبێ و دەشتێکی فرەوان لەو نێوچە دروست دەبێت.

پلەی گەرما لە هەندێ رۆژانی وەرزی زستان بۆ ژێر سفر دادەبەزی و بەفر و بارانی زۆری لێ دەبارێت. وەلێ ئەم سالّ مانگی کانوونی یەکەمیش وا تەواو دەبێ بەفر نەباریوە. لە مانگی ڕابردوو کەمێك باران باری و بە هۆیەوە گیاوگۆڵ لە دەشتێ بە تایبەتی لە دەوڕێی کەشکاوا ـ بامشمش شین بووە. مەترسی باران نە بارین بالّی بەسەر نێوچەکە شۆڕکردووتەوە.

ئاوی سەرزەوی نێوچەکە بریتییە لە رووباری خازر و رووباری بەریشۆ و ژمارەییێك لە چەمی زستانی و بەهاری.

**ـ رووباری خازر**

ئەم رووبارە لە ئاوی گوندەکانی سیانێ گارە و ئەرگنا و کافیا، پێك دێت. لە گوندی دووپرێ لە چیای دێتە دەرێ و بە رۆژئاوای گوندی کەشکاوا بەرەو باشوور تێدەپەڕی. لە خوار گوندی کەشکاوا لەگەلّ ئاوی بەریشۆ، کە لە رۆژهەلاتەوە دێت تێکەلّ دەبێ و بە ناوی رووباری خازر، بە باشووری گوندی بلمەنت، بەرەو گەلی

ئیسماوا، دەڕوات، لە گەلی ئیسماوا لەگەڵ زەردە رووبار کە لە لای بەرواری دێت، تێکەڵ دەبێت و پاشان بە دۆڵی ئیسماوا دەڕوات تاکو دەرژێتە زێی گەورە.

ئاو لە رووباری خازر، لەبەر وشکە ساڵی پار و ئیمساڵ، یەکجار کەم بووە. ئێستا ئاوێکی یەکجار زۆر کەمی پێ دادێت. ئەو کاتانەی ئاوی خازر بۆ ئاودانی باغ و باغاتی گوندەکانی سەری دەگیرێتەوە، ئاو ناگاتە گەلی ئیسماوا.

دوو پرد، لە سەر رووباری خازر هەیە. یەکەکیان لە نزیک گوندی کەشکاوایە، ئەوی دیکەیان، لە دۆڵی ئیسماوایە، پێش ئەوەی بگەیتە گوندی بلمەنت. بە دوو سێ کیلۆمەتر.

رووباری خازر ناوچەی تیارییەکان، لە باکوور بۆ باشوور، دەبڕی. رۆژهەڵاتەکەی لە رووی ئیدارییەوە، لە چوارچێوەی ناحیەی نەهلێ یە و رۆژئاوایەکەشی، لە سنووری ناحیەی چەمانکێ یە. سنووری ئیداری قەزای ئامێدی لە رۆژئاوا و قەزای ئاکرێ لە رۆژهەڵات، بەو رووبارە، تێپەڕ دەبێ.

**ـ رووباری بەریشۆ**

ئەم رووبارە لە رۆژهەڵات بەرەو رۆژئاوا دێت. لە ئاوی گوندەکانی ژێر چیا پێکهاتووە و لە خوار گوندی کەشکاوا، لەگەڵ رووباری خازر تێکەڵ دەبێت و بە ناو رووباری خازر بەرەو گەلی ئیسماوا، دەڕوات.

چیایەکانی دەوروبەری دۆڵی نەهلێ پڕن لە داربەڕوو و هەندێك داری کێوی بەبەر وەکو گێوژ و سماق و کرۆسك و چەشنی دیکە. بەرزی دارەکان لە سێ مەتر زێترە و قەدەکانیان دەگاتە سی سانتیمەتر. ساڵانە دارێکی زۆر لەو دارستانانە، بۆ تەندووری نان و سۆبەی ماڵەکان و ئاو گەرمکردن دەبڕێ.

دارەکانی کە بۆ سووتاندن بەکار دەهێندرێن، دوو جۆرن. یەکەکیان پیان دەگوترێت داری بەری ـ ئەو دارانە رەقن و درەنگ دەسووتێن و پشکۆیان درەنگ تەواو

دەبن و گەرمایان بە تینە. دووەمیان پێیان دەگوترێ داری ئاسایی، ئەوەیان لە گشت سیفەتەکانی بە پێچەوانەی یەکەمە. هەر لەبەر هەندێکەش لە کڕیندا، پارەی کەمتر دەکات.

هەندێك لە گیایەکانی دۆڵی نەهلێ، ئەوانەی بۆ خواردنی مرۆ دەست دەدەن ئەمانەن : لەگنە (بە کوردی کەنگر) و نیتخا (بە کوردی پونگ) و تومەنیشا (بە عارەبی کیراتا) و حەمزە (بەکوردی حەمزە) و یەمیسێ (بە کوردی ڕێواس) و پەترویانە (بە کوردی کوارگ) و ئەرداشە ( بە کوردی هەندك ترشا) و زۆری دیکە. ئەوانەی بۆ خواردنی مرۆ نابن و ئاژەڵ دەیانخوا ئەمانەن : سلەرتە (بە کوردی سێ پەڕە) و قەرامە (بە کوردی .....) و قیتو (بە کوردی قونجیرکە یان سێ سو) و زۆری دیکە.

## ژمارەی تیارییەکان لە دۆڵی نەهلێ

ژمارەی دانیشتوانی گوندەکانی نەهلێ کە لەخوارەوە ناوم نووسیون، بە گوێرەی سەرژمێری دانیشتوانی عیراق لە ساڵی ١٩٧٧دا، نزیکەی ٨٠٠ کەس بوو (٢). بە گوێرەی زانیارییەکانی قەشەی هیزانی لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی دوو هەزار و هەشت نزیکەی ٢٠٠ خێزان، بوو. ئەگەر هەر خێزانێك پێنج کەسی بۆ دابندرێت، ئەوە ژمارەکە دەکاتە ١٠٠٠ کەس. واتە ٢٠٠ کەسی زیادکردووە. ژمارەکە دوو تاکو سێ ئەوەندە دەبێت، گەر بێتوو تیارییەکانی مجمع (مەبەست مجمعی تیارییەکانە لە ئاکرێ) بخرێتە سەر ژمارەکە. کەسانێکی زۆر لە دانیشتوانی نێوچەی لێکۆڵینەوە، بۆ ئەورووپا و ئوستralیا و شوێنی دیکە کۆچیان کردووە.

## گوندەکانی تیاریی لە دەشتی نەهلێ

گوندەکانی تیاریی، وەکو پێشتر نووسیومە، ئەوانەن کە لە خوارەوە باسی هەندێ لایەنیان دەکەم.

**١ـ بلمەنت**

گەورەترین گوندی نێوچـەی لێکۆڵینەوەیـە. نزیکـەی پـەنجاو پێـنج خێزانـی تێـدا نیشتەجێیە. خانووەکانی کەوتوونەتە دەستە ڕاستی جادەی کە بۆ هیزانێ دەچیت. خاوەنی کارەبای نیشتمانی و موەلدە و ئاوی بۆڕی و دوکانی بەقاڵییە. بۆ قوتابخانە و کاروباری ئاینی و مردوو ناشتن روو لە هیزان دەکەن. خانووەکانی پـەرتن و زەوی بەتاڵ لە نێوانیان هەیە.

لە سەردانی یەکەمم بۆ دۆڵی نەهلێ، لەبەر ئـەوەی وێنـەی دوو کەسـم گـرت کـە داریان دەشکان، ژنێك زۆر بە تووڕەیی قسەی لەگەڵ کـردم، لـەوە دەترسـا نـەوەك وێنەکان بە لایەنێکی خراپ نیشان بدەم و گرفتیان بـۆ دروسـت بێـت. وەلـێ تـێم گەیاند کە من چ کارەم.

**٢ـ رەبەتکێ**

کەوتووتە رۆژئاوای گوندی بلمەنت بە دووری دوو سێ کیلۆمەتر. جادەی لە بلمەنت بۆ دەچێ. نزیکەی بیست ماڵ دەبێت. قوتابخانە و کەنیسەی خۆی هەیـە. دوکـانی بەقاڵی هەیە. کارەبای نیشتمانی و مولّدە و ئاوی بۆری هەیە.

**٣ـ ژولێ**

کەوتووتە دەستەچەپی جادەی نێوان هیزان و خەلیلان. بە دووری بیست چـرکە بـە پـێ. خانووەکانی کەوتوونەتە دەستە چەپی جادەیەك و لە نێوانیاندا زەوی بەتاڵ هەیـە. وەلـێ خانووەکانی سەرەوەی گوندی، لەچاو ئەوانـەی پێـشەوە، لەسـەر گـردە و لێـك نـزیکن. کارەبای نیشتمانی و موەلدە و دوکانی بەقاڵی هەیە. منداڵەکانیان بۆ خوێنـدن دەبرێنـە هیزان و رێورەسمی ئاینی لە هیزان دەکەن. نزیکەی بیست و پێنج خیزانی لێ دەژی.

**٤ـ خەلیلان**

ئەم گوندە جادەی نێوان هیزان و کەشکاوای بە ناوی تێ دەپەڕێت. خانووەکانی لەم بەر ئەو بەری جادە هەڵکەوتوون، لە نێوان خانووێك و خانووێکی دیکە زەوی بەتاڵ

هەیە. نزیکەی بیست و پێنج ماڵ دەبێ. قوتابخانە و کلیسە و بنکـەی تەندروسـتی نییە. دوکانی بەقاڵی هەیە. کارەبای نیشتمانی و موەلدە و ئاوی بۆری هەیە.

**٥ـ کەشکاوا**

ئەو گوندە لەگەڵ رووباری خازر، بە درێژایی نزیکەی یەك کیلۆمەتر، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، درێژ دەبێتەوە. ژمارەی خانووەکانی پەنجا و سێ خانووە. وەلێ تەنیا سی و یەکیان ئاوەدانە. ئەوانی دیکە، لەبەر ئەوەی خاوەنـەکانیان، بـۆ شـوێنی دیکـە کۆچیان کردووە، بەتاڵن.

کەنیسە و بنایەی قوتابخانە و موەلدە و تۆڕی ئاو، کە هێشتا تەواو نەبووە، هەیە قوتابخانەکە، لەبەر کەمی ژمارەی قوتابیانی کوڕ و کـچ، خوێنـدنی لـێ نـاکرێ و قوتابییەکان، بۆ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی، بە ترومبێل، کە بۆ هینان و بردنی قوتابیان گیراوە، بەیانیان قوتابییەکان بۆ قوتابخانەی هیزان دەبا و دوای تەواوبوونی خوێندن، بۆ گوند دەیان هێنێتەوە.

**٦ـ میرۆکێ**

چەند کیلۆمەترێك لە رۆژئاوای گوندی بلمەنت دوورە. جادەی بۆ دەچێت. نزیکـەی دوازدە خێزان لەو گوندە دەژیـن. کارەبـای نیـشتمانی و موەلـدە و ئـاوی بـۆری و دوکانی بەقاڵی هەیە. خانووەکان کەمێك پەرتن.

**٧ـ هیزانکێ**

جادەی نێوان بلمەنت و کەشکاوای بە ناودا تێدەپەڕێت. خانووەکانی لە نێـوان ئـەم بەر و ئەو بەر جادە، دابەش بووینـە و زەوی بـەتاڵ لـە نێوانیانـدا زۆرە. نزیکـەی سی و شەش خێزان، لەو گوندە، دەژین. کارەبای نیـشتمانی و موەلـدە و دوکـانی بەقاڵی و کەنیسە و قوتابخانەی بنەڕەتی و ئامادەیی هەیە.

گشت خانووی گوندی تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ بــە بلـۆك و چـیمەنتۆ، لــە لایــەن ڕێکخراوی خێرخوازی ئەوروپایی دروست کراون. خانووەکان، وەکو لە نەخشەی نمرە ٣ دەردەکــەوێت، بــە پەنجــەرە و نانــدین و سەرشــۆر و ئاودەســتخانە و حەوشــەی چیمەنتۆ ڕێژ و باخچەیێکی خنجیلانەی هەیە.

خانووەکان لەبەر ئەوەی خەسڵەتی کشتوکاڵی دانیشتوانەکانیان لەبەر چاو نەگیراوە، هەندێ شوێنی زۆر پێویست بە نموونە، هۆڵی حەیوان و کادین و ژوور بۆ ڕەشــەوڵاغ و کۆریت بۆ مریشکان و شتی دیکەی بۆیان نەکراوە. لەبەر ئەوە خەڵکەکە خۆیــان ئەو شوێنانەیان لە خــشت و دار و چــەپەر و پــووش و نــایلۆن و کەرســتەی دیکــە دروست کردووە. کەوابێ گوندەکان لــە لایــەنی بیناســازییەوە، ســیمای مــۆدێرن و ترادیسۆنیان بە خۆوە گرتووە.

## بەشی دووەم

## بنەمای ئابووری تیارییەکان

نێوچەی تیارییەکان لە دۆڵی نەهلێ، زەویوزاری کشتوکاڵی زۆری، هەیــە. بەشــێك لەو زەوییانە کەوتوونەتە ئەم بەر و ئەو بەری ڕووباری خازر و ڕووباری بەریشۆ و بە گشتی تەختایین، بەشەکەی دیکەی لە ڕووبارەکانــەوە دوورە و بــە گــشتی کەنــد و لەندن.

### کێشەی زەوی

تیارییەکان، لە نێو خۆیاندا، لەبەر ئەوەی هەر یەك تاپۆی خۆی هەیە، کێشەیان لە سەر زەوی نییە. وەلێ پێیان وایە زێبارییەکان، لــە هەنــدێ شــوێنان زەوییــان لــێ زەفت کردوون یان خانوویان بێ پرس لەســەر کــردووە. بــە مەبەســتی ڕێگــرتن لــە

دەستدرێژی زێبارییەکان بۆ سەر زەوییەکانیان، چەندین جار سکالاَیان لای قایمقامی ئامێدی و ناوچەی پارتی دیموکراتی کوردستان کردووە. وەلیٚ بە قسەی خۆیان کەس گوێی لیٚ نەگرتوون.

زەوی وەکو میرات بۆ کوڕ دەمینێتەوە و هەر یەکەیان بەشێکی بەبەر دەکەوێت، بە نموونە، گەر باوکێك سیٚ کوڕی هەبێت، موڵکەکەی بە یەکسانی لە نێوانیاندا، دابەش دەکرێت . باوکیش، چەند ساڵ بەر لە ئەمرۆ، لەبەر ئەوەی لە لای یەك لە کوڕەکانی دەژیا، زەوییەکەی پێش مردنی بەسەر کوڕەکانی دابەش دەکرد. وەلیٚ ئەمرۆ لە ترسی ئەوەی نەوەك کوڕەکان بە خۆیانی نەگرن، موڵکەکەی تاکو مردن نابەشیتەوە.

تیارییەکان، کچیان، لە بەشە زەوی دوای مردنی باوك، بیٚ بەش دەکەن. ئەو نەریتە دەگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتۆرێك بە نموونە، ڕیٚ نەدان بە کچ، دوای نەمانی باوك لە خانوویێك بیٚ سەرپەرشتی برا یان ئامۆزا یان هەر کەسێکی زۆر نزیکی، بە تەنیا بژیت. کاتی مێردکردنیش، ئەگەر خاوەن زەوی بێت، زەوییەکە بە شێوەیێك لە شێوان، دەبێت بە موڵکی هاوسەرەکەی. بەم شێوە بەشێك لە زەوی باوك دەبێت بە هی کەسێکی بیانی ئەوەش بۆ تیارییەکان جێگەی قەبوڵ نییە. بە هی مێردەکەی دەدات، واتە، بەشێك لە موڵکی باوك بۆ بێگانەیێك دەبیٚ. ئەوەش بە لای باوك و برایەکانی شتێکە کە ناتوانن پێی رازی بن.

**زەوی بەکرێدان**

تیارییەکان، بەشێك لە زەوییەکانی کشتوکاڵی بەردەستیان، لەبەر ئەوەی خۆیان بەسەریان ڕاناگەن یان دەستیان لە کشتوکاڵکردن هەڵگرتووە یان بۆ شارەکان کۆچیان کردووە یان لە شوێنەکانی خۆیان خەریکی کارێکی دیکەن، دەدەن بە جووتیارە کوردەکانی دەوروبەریان. ئەوەش وای کردووە پەیوەندییێکی چەند ساڵە لە

نێوان خاوەن زەوییەکان و زەوی بەکرێ گرتەکان، پەیدا بێت و متمانـەی تـەواو لـە نێوان هەردوو لا، پەیدا بێت.. چەشنەکانی بەکرێدانی زەوی، وەکـو خانەخێیەکـەم بۆی باس کردم، بەو شێوانەی خوارەوەیە.

١. بە نیوە

خاوەن زەوی (موڵکدار) تۆ و دەرمـان، بـە کەسـێك دەدات. ئـەویش دەیـچێنی و دەرمانی دەکات و دەیدووریتەوە و دەیکوتی. ئینجا بەرهەمەکە، وەکـو یـەك، لـە نێوان خۆیان دابەش دەکـەن. تیارییـەکان، زەوییـەکانیان، لەبـەر ئـەوەی داهـاتی ساڵانەیان بەقەدر داهاتی بە کرێ گرتەکانە، ئەو چەشنە ئەرێنـدە (بـەکرێ دان) لا باشتر و بە سوودترە.

٢. دوو بە یەك

خاوەن زەوی (موڵکدار) زەوییەکەی بـە کەسـێك دەدات. ئـەویش تـۆی دەکـات و دەرمانی بۆ دەکڕێ و دەیدووریتەوە و دەیکوتی. ئینجا بەرهەمەکە، دەکرێ بە سێ بەش دوو بەشی بۆ کرێ گرتە دەمینێتەوە و بەشەکەی دیکەش، ئەدرێ بـە خـاوەن زەوی.

تیارییەکان، لەبەر ئەوەی دەستکەوتی ساڵانەیان، لەو چەشنە بە کرێدانە کەمە، بە نموونە، ئەگەر داهاتی زەوییـەکانیان ٣٠٠ هـەزار دینـار بـێ، ئـەوە ١٠٠ هـەزار دیناریان بەر دەکەوێت، کەمتر ئەو جۆرە مامەڵەی لەگـەڵ جووتیارەکـان، دەکـەن. هەندێ جار لە ترسی کێشە دروست بوون. زەوییەکانیان، بە کرێ نادەن.

**کشتوکاڵ**

دەشتی نەهلێ، وەکو شوێنەکانی دیکەی باشووری کوردستان، کشتوکاڵی زسـتانی و هاوینی لێ دەکرێ. لێرە گەنم و جۆ و برنج و نیسك و ماش و دانەوێڵـەی دیکـە

دەچێندرێت. ئەوەی سەرنجی منی، لە کاتی سەردانەکانی مەیدانی، بۆ خۆی کێشا چاندنی برنج بوو. هەر ئەوەش وای کردووە، کە کەمێك بە درێژی باسی بکرێت.

**برنج**

چاندنی برنج لەم بەر ئەو بەری رووباری خازر و رووباری بەریشۆ، چ لە زەوی تیارییەکان و چ لە زەوی زێبارییەکان، لە نیسانێ تاکو کۆتایی مایس، دەچیندرێ.

دوای بە سەرچوونی پێنج مانگ، واتە لە کۆتایی تشرینی یەکەم، پێ دەگات.

شێوەی چاندنی برنج لەو ناوچە بەو شێوەیە : تۆیەکەی، بۆ ئەوەی بپەقی، لە کوندە دەکرێت. ئەگەر وانەبێ بەر لە شینبوونی، لە ژێر گڵ دەڕزی و کە رزیش شین نابێ. ئینجا زەوییەکەی لەسەر شێوەی مشارە (حەوز) دابەش دەکرێ و ئاوی بە قەدەر دوو پەنجە، بەردەدەنەوە سەرێ. تۆکردنەکەش، بە لە خوا پاڕانەوە و بەو شێوە، دەست پێ دەکات

| | |
|---|---|
| شمط ئالا | بە ناوی خودا |
| ئیشو مشیخا | بە ناوی عیسا |
| صلیوە مارن | خاچی عیسا |

مەبەست لە ناو هینانی خوا و عیسا و خاچ، بۆ ئەوەیە برنجەکە بەرەکەتی بکەوتێ و شین بێ و بڕکردنی باش بێ و لە سووتان بە دوور بێ، بە کورتی خێر بداتەوە.

**چەشنەکانی برنج**

تیارییەکان برنجی، بە گوێرەی ماوەی شین بوون و دروێنەکردن ناودەنێن. لە خوارەوە، ناوی ئەو چەشنە برنجانە دەنووسم، کە لە دۆڵی نەهلێ، سالآنە کەم و زۆر دەچیندرێن :

١. کەس نەدیت

٢. سێ مەیی (سێ مانگی)

٣. شەش مەیی (شەش مانگی)

٤ مولەفا (چەشنێکی ئەمریکییە)

تیارییەکان، ئەگەر بێتوو قنایەك (مەبەست بنە چەڵتووکە) بکەویتە سەر عەردی با گوڵە برنجیشی زۆر پێوە بێ، لەبەر ئەوەی پێیان وایە ڕزقی حەیوان و باڵدارانە، لە شوێنی خۆی جێی دەهێڵن و هەڵی ناگرنەوە.

تیارییەکان، وەکو هەندێ شوێنی دیکەی، دەشتی نەهلێ، دانەوێڵەیان بە تەغار (یەك تەغار ـ ٢٠ وەزنەیە) و وەزنە (یەك وەزنە ـ ٢ کیلۆ گرامە)، دەور دەکەنەوە.

دانەوێڵەکانی دیکەی وەکو گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و ماش، لەبەر دەستکەوتی کەم و کەمی زەوی کشتوکاڵی، تیارییەکان ئەوەندەی برنج بایەخیان پێ نادەن. پێویستیی ساڵانەیان لە بازاڕ دەستەبەر دەکەن.

**فیقی (میوە)**

ئاووهەوا و خاك لە دەشتی نەهلێ، بۆ چاندن و شینبوون و بەرگرتنی، درەختی بەبەری جۆراوجۆر، بە نموونە، سێو و خۆخ و رەز و هەنجیر و هیدیکە، لە لایەن تیارییەکانەوە، قۆزراوەتەوە. بۆ ئەو مەبەستە سەدان مەتری چوار گۆشە لە زەوی کشتوکاڵی، بۆ چاندنی مێوە، لەسەر شێوەی باخچەی گەورە و پەرژینکراو، لێرە و لە وێ، بە نموونە، باخچەکانی نێوان گوندی کەشکاوا و خەلیلانی، لادراوە.

تیارییەکان، لەبەر ئەوەی داهاتی ساڵانەیان، لە چاو ماندووبوونیان، زۆر کەمە، بە دڵگرانی ئیشی باخچە دەکەن یان بە تەواوی دەستیان لێ بەرداوە. بە نموونە، خانەخێیەکەم لە فرۆشتنی بەری یەکەمی خۆخی باخچەکەی یەك ملیۆن دیناری دەست کەوتووە و بەری دووەم و سێیەمیشی، لەبەر پارە نەکرد و گرانی کرێ، بە نموونە، ئەگەر یەك سەندوق خۆخ پێنج هەزار دینار بکات ئەوە ١٥٠٠ دیناری

ئەدرێت بە کرێی گواستنەوە، لە شوێنی خۆی ڕزیوە. هەندێ باخچە چەند ساڵە، وەکو بۆیان باس کردووم، بە تەواوی بەریان نەداوە. خۆشیان سەریان لەم کارە سوڕماوە و هۆکارەکانیان لا روون نییە.

مەڕومالاَت

بەخێوکردنی ئاژەڵ و بە تایبەتی مەڕومالاَت، یەك لە کارە سەرەکییەکانی چەند خێزانە لە هەر یەك لە گوندەکانی دۆڵی نەهلێ یە. بە نموونە، لە گوندی کەشکاوا خێزانی قیصر (٨٠ سەر مەڕ و ١٥ بزن) و ئیسف (٧٠ سەرمەڕ و بزن) و کورش و هیدیکە.

دوو مەڕدار یان زێتر، بەیانییان مێگەلەکانیان تێکەڵ بە یەك دەکەن و بۆ دەشتێ ڕایان دەدەن و پێش رۆژئاوابوون، بۆ گوندیان دەهێننەوە. هینان و بردنی مەڕەکان، هەر جارەی لە ئەستۆی مەڕدارێکە. بە نموونە، قیصر و ئیسف، هەر یەکەیان سێ رۆژ دەچنە بەر مەڕەکان. پێش یەك دوو مانگ، لەبەر ئەوەی چوار مێگەل تێکەڵ بە یەك دەکران، هەر یەکەیان دوو رۆژ شوانی دەکرد.

بەیانییان مەڕوبزنەکان، بێ هیچ گرفتێك تێکەڵ بە یەك دەبن و پێکەوە تاکو ئێوارە دەلەوەڕێن. ئێوارانیش هەر یەکە بەرەو ماڵی خاوەنەکەی ملی رێ دەگرێت. ئەو مەڕانەی لێیان تێك دەچێ، دوای کەمێك هەست بە هەڵەی خۆیان دەکەن و یەکسەر، بە چەشنێکی سەرنجڕاکێش، دەسووڕێنەوە و تێکەڵی مێگەلەکەی خۆیان دەبنەوە.

هەندێك لە خەسڵەتەکانی بەخێوکردنی مەڕومالاَت لە نێو تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ ئەمانەی خوارەوەن :

١. ساڵێ دوومانگ بە گوێرەی سەرما و بەفروباران لە نێوان کانوونی دووەم و مارتدا، لە گوندی بۆ دەشتێ ڕانادرێن و ئالیك دەدرێن.

٢. ئالیکی مەڕومالاّت بریتییە لە کا و جۆ و هەندێ جەمیش بەری مازکێ (بەڕوویێکی کەمێك لە بەڕووی ئاسایی درێژتر و باریکترە. تاڵە و بۆ خواردنی مرۆڤ نابێت)

٣. مەڕدارەکان، بۆ ئەوەی مەڕەکانیان بە تاقەت بن و بەرخەکانیان تێر شیربێ و بای ماست و پەنیر، شیریان هەبێت، رێ لە ساڵێ دوو جار زان دەگرن.

٤. چەروەنی سروشتی، لە دۆڵی نەهلێ، لە چاو زۆربەی نێوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان، باشە. بە نموونە، گیاوگۆڵی شینبووی دوای بارانی مانگی تشرینی دووەم، تاکو ڕادەیێك مەڕومالاّتی تێر دەکات.

٥) تیارییەکان، بە مەبەستی زیادکردنی مەڕ بۆ شیر و زاوزێ، بەرخە مێیەکان دەهێڵنەوە. وەلێ بەرخە نێرەکان و ئەو بەرخە مێیانەی کە دایکیان شیریان کەمە یان نەخۆشن، ئێواران بۆ یەك دوو مانگ ئالیك دەدرێن و لە تەمەنی چوار پێنج مانگیدا دەیان فرۆشن. نرخی بەرخێکی چوار مانگانەی باش لە گوندی کەشکاوا ١٠٠ هەزار دینار و هی مەڕ ١٤٠ هەزار دینارە.

٦) ئەو مەڕ و بزنانەی بە سگێك دوو بەرخ یان دوو کاران دەینن و وەرزی زستان بێ، ئەوە، خاوەنەکەی، بۆ ئەوەی دایکەکە شیری زێتر بدات و ئەوەی دەمینێتەوە قەڵەو بێ، یەکەکیان دەبەخشیتەوە. وەلێ لە وەرزی بەهار، لەبەر هەبوونی لەوەڕ، بەرخ و کار نابەخشرێتەوە.

## هەندێك زاراوەی تایبەت بە بەخێوکردنی مەڕومالاّت

بەخێوکردنی مەڕومالاّت لە ناو تیارییەکان، وەکو هەر شوێنێکی دیکە، زمانی خۆی هەیە. من لێرە مەبەستم نییە، باس لە گشت زاراوەکانی ئەو سێکتەرەی ئابووری تیارییەکان بکەم، وەلێ، وەك نموونە، باسی ئەوانەی خوارەوە دەکەم :

**بوگا**

کەرستەییێکی هەشت پێ درێژە. بەرزی ڕۆخەکانی یەك پێ دەبێ. ئەو سەر و ئەو سەری بە تەنەگە یان دار گیراوە. ئالیکی (کاو و جۆ) تێدەکرێ و حەیوانی دێتە سەرێ. لە شوێنی دیکە. مەڕداره کوردەکان، بەو کەرستە دەڵێن، کۆلی ئالیکی.

**هوزالا گللا**

بەو گیایە دوورواوە و هیشك بووە، کە بە دەوری دارێك و دوو سێ مەتری بەرز بەسەر یەکەوە کەڵەکە کراوە، دەگوترێ. لە ناو جووتیارە کوردەکان بە .... ناسراوە.

**گۆمات ئیروێ**

ژوورێکە لە بەرد و قوڕ دروست کراوە. بەرزییەکەی نزیکەی دوو مەتر دەبێ دەرکەی تەنەکەیە. لە زستاندا، حەیوانی تێ دەکرێ. مەڕدارە کوردەکان بەو خانووە، دەڵێن ژووری حەیوانان.

**کۆخا**

ژوورێکی لاکێشییە و سەرەکەی جزیرییە. لە کاریتە و شەقرە و چیغ و چەپەر و پووش و مشەما (مشەمای لە دیوارەکە دەدرێ بۆ ڕێ گرتن لە هاتنی با بۆ ناو ژوورەکە)، بە مەبەستی پاراستنی حەیوان لە سەرمای زستان، دروست کراوە. درێژی و پانی دەوەستێتە سەر ژمارەی حەیوانەکان. بەگشتی پێنج مەتر درێژی و سێ مەتر پانی دەبێت.

کۆخا لە ناوەوە بە ناوبڕەیێك کراوە بە دووبەش. بەشی لای دەرکەی بۆ بەرخ و کار و مەڕی تازە زاو تەرخان کراوە. هەر لەم بەشە شوێنێك بە چەپەر بە درێژی دوو سێ مەتر، بۆ بەرخ و کار، بۆ ئەوەی نەکەونە بن دەست و پێی مەڕ و بزنەکان، جودا کراوەتەوە.

کۆخەکان تاریکن و لەبەر ئەوەی رۆژ بە رۆژ خاوێن ناکرێنەوە، پیس دیارن و بۆنی ناخۆشی لێ هەڵدەستێت. حەوشێکی پەرژینکراوی بە تێلی درك یان چەپەر، فرەوانی لە پێشە. مێگەلی لە دەرکەیێکی گەورە دێتە ناو حەوشەکە. وەلێ مرۆ لە دەرکەیێکی بچووکتر کە بە چەپەر یان دەرکەیێکی تەنەکە، گیراوە هاتوچۆی بۆ ناو کۆخا دەکات. مەڕدارە کوردەکان، لە هەندێ نێوچەدا، بەو خانووە، دەڵێن کۆتان.

**مێگەل بۆ بەخێوکردن**

مەڕدارەکانی تیارییەکان، وەکو هی کوردەکان، ئەوانەی بە خۆیان توانای بەخێوکردنی مەڕومالاتیان نەماوە، یان کارێکی بە سوودتر و کەم ماندوو بوون دەکەن، مێگەلەکەیان، بۆ بە خێوکردن، بە کەسێك دەدەن. شێوەی دانەکەش بەو شێوەیە :

**١ـ بەر نیوەیی**

خاوەن مەڕ مێگەلە مەڕ و بزنەکەی، بۆ ساڵێك، بە کەسێکی دەدات. دوای تەواوبوونی ماوەکە، مەڕەکان و نیوەی بەرخەکان، جگە لە ماست و پەنیر و کەرە و خوری، دەدرێتەوە خاوەنی ئەسڵی.

**٢ـ بە نیوەیی**

خاوەن مەڕ مێگەلە مەڕ و بزنەکەی، بۆ چوار ساڵ، بە کەسێکی دەدات. دوای تەواوبوونی ماوەکە، تەواوی مێگەلەکە لە نێوانیان، دابەش دەکرێت.

**پیشەی دەستکرد**

تیارییەکان بەر لە چەندین ساڵ، وەکو دراوسێیەکانیان، پێویستییەکانی ژیانیان وەکو جل و بەرگ و هەندێ ناو ماڵ وکەرستەی کشتوکاڵی و ئەوانەی بۆ حەوانەوەی ئاژەڵ و تاوتوێکردنی شیر، پێویست بوون، بە دەستی لە ماڵان دروست

دەکران یان لە دوکانی بەرگدروو و نەجار و ئاسنگەر و چەخماخچی، دابین کراون. ئەمڕۆ بەرهەمی ئەو شوێنانە، لەبەر پەیدابوونی کارگە و تیکنۆلۆژیای تازە نە باویان ماوە و نە بە شێوەی جاران بەکار دەهێندرێن. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك شت، بە نموونە، ئەوانەی خوارەوە، هێشتا لای هەندێ خێزانی تیارییەکان، هەر ماوە.

**- چەپەر**

دەستکردێکە، لە رووی کەرستە و شێوەی دروستکردن، لە چیغ یان سەبەتەی نانی یان قەرتارەی ترێ، دەچیت. پانی و درێژی دەوەستێتە سەر ئەو مەبەستەی بۆی دروست کراوە، وەك دەرکە و پەرژین و کۆز و شتی دیکە.

من باسی دروستکردنی ئەو چەپەرە دەکەم کە بەدەستی خێزانی خانەخوێیەکەم لە گوندی کەشکاوا، دروست دەکرا:

یازدە کەلی داری بە ئەستووری پێنج سانتیمەتر و بەرزی دوو مەتر لە ریز یەك لە زەوی چەقاندبوو. نێوان کەلێك و کەلێك بیست سانتیمەتر بوو. لە دەستی چەپی چەندین شووڕکی لەسەر زەوی دانابوو. هەر جارەی دەستی دەدایە دووانیان و پێکەوەی دەیگرتن. جارێکیان لە دەستە ڕاست بۆ دەستە چەپ و و جارێکی دیکە لە دەستە چەپ بۆ دەستە ڕاست و ڕاست و چەپ (وەك هونانەوەی کەزی) بە نێو یەك بە یەك کەلەکانی دەبردن و دەیکوتان. پاشان بنی لکەکانی بە یەك ئەندازە قوت دەکردن.

## بەشی سێیەم

## بنەمای کۆمەڵایەتی تیارییەکان

توێژەرانی بواری جودا، لەسەر ئیتنۆگنیز و ناوبردنیان بە ئاشووری ـ ئاسووری، لە بەر بە سیاسی بوونی کێشەکە و دوور کەوتنەوە لە زانست و حەساسیەتی خۆ

بەگـەورە زانـین، یـەك دەنـگ نـین. بـە بۆچـوونی دەسـتەییێکیان، ئـەبێ نـەوەی ئاشوورییەکان بن، ئەو بۆچوونە بە گەرمی لە لایەن نـەوەی ئـەمرۆ، لـە باشـووری کوردستاندا بە گشتی و لە ئەوروپادا بە تایبەتی، پشتیوانی گـەرمی لـێ دەکـرێ. ئەو بۆچوونە، بە بۆچوونی دەستێکی دیکە، جگە لە بنەمای سیاسی، بنـەماییێکی دیکەی بە خۆوە نـابینی. مـن لـەو کێـشمە کێـشمە، لەبـەر ئـەوەی کـاری مـن توێژینەوەییێکی مەیدانییە و ناشتوانم شتێکی تازە بخەمە سەر ئەوانەی تاکو ئێستا گوتراون و دەگوترێن، خۆ دوور گرتنم، زێتر خزمەت بە زانست دەکات.

**عەشیرەتەکانی ئاشووری**

ئاشوورییەکانی کوردستان، لە چوار عەشیرەتی سـەرەکی، بـە ناوەکـانی خـوارەوە، پێك هاتووە.

**یەکەم. تیاری**

١. تیاری ژووری (تیاری بچووك)

سەرۆکی ئەو تیارییانە بنەماڵەی (مالك اسماعیل) ە. بریتییە لە چەند هۆزێك. بـە نموونە: سەرسپیلۆ و بنی رومتا (واتە نەوەی گرد) ... و هتد

عەشیرەتی نـاوبراو، لـە سـاڵی **١٩٣٣**دا، لەگـەڵ مالـك اسماعیـل، لـە باشـووری کوردستانەوە (عێراق)، بە هۆی شکست هێنانی بزووتنەوەکەیان و خـۆ نـەگرتنیان بەرامبەر بە سوپای عێراق، بۆ رۆژئاوای کوردستان (سوریا) کۆچـیان کـرد. وەلـێ دانیشتوانی گوندی کۆراگاڤان، لە شـوێنی خۆیـان مانـەوە. گـەورەی ئـەو گونـدە پیاوێك بوو بە ناوی رییس چیکۆ باوکی شەهید هرمز و خێزانەکـەی کـچی مالـك اسماعیل بوو. مالك خوشابا، لەبەر ئەوەی تیاری بچووك لەوانە زێتر لـە باشـووری کوردستان نەمابوون و بۆ رێز لێنان لە مالك اسماعیل، داوای لە گشت تیارییـەکان کرد بە مالك چیکۆ بانگی بکەن.

**٢. تیاری ژێری (تیاری گەورە)**

سەرۆکی ئەو تیاریيانە، بنەماڵەی (پولص)ە. بریتییە لە ئۆجاغ (بـەرەباب) ەکـانی خوارەوە:

- بنی ماپا (واتە نەوەی گوند یان دەشتەکی)
- بنی گپە (واتە نەوەی ئەشکەوت یان چیایی)
- بنی بێلاپا (بێلاتی شیان پێ دەگوترێ)
- منیانش (بچووکترین قەبیلەی تیاری)
- زاویتی
- گەلی
- ئاشوتی (واتە نەوەی شوێنی هەرەسهێنانی بەفر) (قەبیلەکی زۆر تێکەڵە)

**دووەم. تخوما**

**سێیەم. جێلۆ**

چوارەم. بەزنایێ ( لای کوردەکانی دراوسێیان بە بازێ ناو دەبرێن)

سێ عەشیرەتی (تخوما و جێلـۆ و بـەزنایێ) دوایـی، لـە بـەر ئـەوەی لێکۆڵینـەوە مەیدانییەکەم، تایبەتە بە تیارییەکان، باسیان ناکەم.

## چینی کۆمەڵایەتی لە ناو تیارییاندا

عەشیرەتی تیاری، لە رووی دەسەڵاتەوە، وەکو لە خوارەوە باسیان دەکـەم، بـۆ دوو چین، دابەش دەکرێن.

**یەکەم. چینی دەسەڵات**

مەبەست کەسانێکە یا بنەماڵەیێکە، کە تیارییـەکان بـۆ چارەسـەرکردنی گـرفتی کۆمەڵایەتی و هەندێ جار ئابووری، روویـان تێدەکـەن. ئەوانـە دەمڕاسـتی گـشت عەشیرەتەکانی تیارین لـە کاروبـاری سیاسـی لەگـەڵ دەوڵـەت و رێکخـراوە نێـو

دەوڵەتییەکاندا. چینی دەسەڵات، لە رووی پایەیی دەسەڵاتەوە، دوو چینە. لە خوارەوە پایە و دەسەڵاتی هەر یەکەیان روون دەکەمەوە.

١. مالك

پایەیی یەکەمی دەسەڵاتە، پایەییێکی پشتاوپشتە. واتە لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمینێتەوە. ئەو زاراوەیە بەرامبەر ئاغای دزەییان و ئاغای زێبارییان و میری خۆشناوان و شێخی بارزانیان ە. سەرۆکی تیاری ژێری (تیاری گەورە)، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بەم شێوە دەست پێ دەکا:

پەتروس دوای ئەو مالك یوسف (ساڵی ١٩٠٠ بەدەستی سەعید بەرواری کوژراوە) دوای ئەو مالك خۆشابا (ئەمەیان سێ کوڕی هەبووە بە ناوی داود و پەتروس و یوسف) دوای ئەو مالك یوسف (ئەمەیان دوو کوڕی هەبووە بە ناوی نینۆس و پۆلس) دوای ئەو مالك پۆلس ئەمەیان کوڕی نەبووە و ئێستا لە شوێنی باوکی دانیشتووە. ئەوەی خوارەوە، وەکو خۆی بۆی گێڕاومەتەوە، ژیاننامەکەیەتی.

* پولس یوسف خوشابا یوسف پەتروس (خەڵك بە پۆلۆ ناوی دەبەن)

* ٣ شوباتی ساڵی ١٩٤٤ لە دایك بووە.

* ١٩٥٨ ـ ١٩٦٤ خوێندنی سەرەتایی لە شاری موسڵ و قوتابخانەی ناوەندی بەتاوین لە بەغدا و قوتابخانەی دواناوەندی نضال لە بەغدا تەواو کردووە.

* ١٩٦٨ ـ ١٩٦٩ قوتابی کۆلێژی سەربازی عیراق بووە.

* ١٧ تشرینی یەکەم ١٩٧٠کۆلێژی سەربازی عیراقی تەواو کردووە و بووەتە ملازم.

* ١٩٨٢ ـ ١٩٩٨ لە شەڕی عێراق و ئێران دیل بووە. لە بەندیخانەکانی ئەهواز و تاران و ئەراك و تەهران و رینا و مغسوس و دەماوەند، بەند کراوە.

* ١٩٩٨ بە روتبەی عەمید لە دایرەی موحاربین کاری کردووە.

* ٢٠٠٥ گەڕاوەتەوە کوردستان (گوندی هیزان) ئێستا لەگەڵ دایکی (الماس اسماعیل شوو بازی ـ ساڵی ١٩٢٠ لە دایك بووە) لە گوندی بابلۆ دەژی. وەلێ زەوی و خانووبەری باوکی لە هیزان ماوە.

٢. ڕەبیس

پایەیی دووەمی دەسەڵاتە. ئەوەش وەکو یەکەم پایەییێکی پشتاوپشتە. واتە کوڕ بە میرات لە باوکییەوە بۆی دەمینێتەوە. ئەو زاراوەیە، ڕەنگە بەرامبەر کوێخای دزەییان بێت. دەسەڵاتی ڕەبیس لە سنووری گوندەکەی دەرناچێت.

دوو پایەیی دەسەڵاتی سەرەوە، لەو ساڵانەی دواییدا، لەبەر گۆڕانی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای تیاریدا، جگە لە ناو و ڕێزلێنان، باوی نەماوە.

٣. موختار

پایەییێکی دیکەی دەسەڵاتە. وەلێ پشتاوپشت نییە. هەر کەسێك بۆی هەیە ببێ بە موختار بە چەند مەرجێك، بە نموونە، لە هەڵبژاردندا زۆرترین دەنگ بێنێ یان بە فەرمی لە لایەن دەوڵەتەوە دیاری بکرێت یان لە لایەن حزبێکی سیاسی دابندرێت. دیاریکردنی موختار هەندێ جار، لەبەر ململانێی حزبایەتی ناکۆکی دەخاتە نێوان دانیشتوانی گوندێك یان کەسی دیاریکراو و کەسی لابردراو، بە نموونە، موختاری گوندی کەشکاوا و شوێنی دیکە.

ـ موختاری گوندەکانی تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ

* زەیا گورگیس ـ موختاری گوندی کەشکاوا

ناوبراو، وەکو خۆی بۆی گێڕامەوە، نزیکەی پەنجا ساڵە، موختاری گوندی کەشکاوایە. وەلێ، لە سەرەتای نۆهەتەکان، لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستان، لە موختاری دەخرێ و قیصر دەخرێتە شوێنەکەی. پاش چەند ساڵان، لەبەر شارەزایی لە کاروباری گوند، هەم لە لایەن ئەو حزبەوە، دەکرێتەوە موختار.

زەیا بەرچم ـ موختاری گوندی چەمی رەبەتکێ
* زەیا یەڵدا ـ موختاری گوندی هیزانکێ سوفلا
* خەنینیا میکائیل ـ موختاری گوندی مێروکێ
* عەورۆ گوریال ـ موختاری گوندی ژولێ
* نویا یاقۆ ـ موختاری گوندی خەلیلان
* عمانوئیل ولیەم ـ موختاری گوندی هیزانێ عولیا
* ولیەم ئیشۆ ـ موختاری گوندی بلمەنت

دەشتی نەهلێ، بەر لە نیشتەجێکردنی تیارییەکان، کوێستانی گوندنشین و لەوەڕی رەوەندەکانی زێبارییان بووە. هەر ئەوە وای لە ئاغای زێبارییەکان کردووە بەو چاوەی تەماشای زێبارییان دەکەن بەو چاوەش تەماشای تیارییەکان بکەن. بە نموونە، رەزا زوبێر مەحمود زێباری، ئەمڕۆ دەسەڵاتی بەسەر تیارییەکانیش هەیە.

**دووەم. چینی بێ دەسەڵات**

مەبەست گشت ئەو تیارییانەن کە لە چینی دەسەڵاتدا نین. ئەمانەش، بە لای منەوە، لە رووی پایەیی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، وەکو لە خوارەوە روونی دەکەمەوە، لە دوو چین پێکهاتووە:

**١. پیاوی ماقووڵ**

ئەمانە، وەکو رەییس و مالك دەسەڵاتی دونیەویان نییە. پایەیێکی کۆمەڵایەتی پشتاوپشت نییە. هەر کەسێکی دەوڵەمەند و شارەزا لە کاروباری دونیا و قسەزان و خۆشەویست بێ لای خەڵك، بۆی هەیە ببێت بە پیاوی ماقووڵ.

**٢. مللەت**

مەبەست لە مللەت، خەڵکی رەمەکییە، ئەو زاراوە، بەرامبەر بە کرمانجی دزەییان و میللەتی سورچییان و میللەتی بارزانیان ە.

**خوێندن**

سەنتەری خوێندنی بنەڕەتی و ئامادەیی، گوندەکانی تیارییەکان، لە هیـزان (یـەك بە دانیشتوانترین گوندی نێوچەکە) دایە.

قوتابخانەی بنەڕەتی هیزان

بە گوێرەی سیستمی خوێندنی تازە لە باشـووری کوردسـتاندا، بریتییـە لـە پـۆلی یەکەم بۆ نۆیەم. بەڕێوەبەری قوتابخانە لە سەرەتای ساڵی خوێنـدنی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ مامۆستاییێکە بە ناوی ریمۆن عۆدیشۆ جێگرەکەی مامۆستاییێکە بـە نـاوی یوخنـا ئیشیا (بەڕێوەبەری پێشوو بوو). مامۆستایەکانی دیکەی قوتابخانەی هیزان لە ٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ ئەمانە بوون:

* ئێرەمیا ئەنویا
* ئیلشوا لازار
* ئەندریوس یوراش
* تەورێز شلیمۆن (کچە)
* جۆرج عۆدیشۆ (مامۆستای زمانی کوردی قۆناغی بنەڕەتی و ئامادەیی)
* دێرا پۆلص (کچە)
* ریمۆن ئەنویا
* ریمۆن خۆشابا
* ناپلیۆن شموئێل
* مریم صۆمۆ (کچە)

ژمارەی قوتابیانی قوتابخانەی بنەڕەتی هیزانی تێکەڵاو لـە ٥ی تـشرینی دووەمـی ساڵی ٢٠٠٨، لە دەفتەری تۆماردا، وەکو بەڕێوەبەری قوتابخانە بۆی خوێندمـەوە، ١٤٤ قوتابی کوڕ و کچ بوو. بەو شێوە لە پۆلەکاندا بوون:

پۆلی یەکەم ـ ١٥ قوتابی (١٢ کوڕ و ٣ کچ)
پۆلی دووەم ـ ١٦ قوتابی (١٢ کوڕ و ٤ کچ
پۆلی سێیەم ـ ١٠ قوتابی (٤ کوڕ و ٦ کچ)
پۆلی چوارەم ـ ١٦ قوتابی (٩ کوڕ و ٧ کچ)
پۆلی پێنجەم ـ ١٧ قوتابی (٩ کوڕ و ٨ کچ)
پۆلی شەشەم ـ ٢٢ قوتابی (١٢ کوڕ ١٠ کچ)
پۆلی حەفتەم ـ ٢٠ قوتابی ( ٩ کوڕ و ١١ کچ)
پۆلی هەشتەم ـ ١٧ قوتابی (١٤ کوڕ و ٣ کچ)
پۆلی نۆیەم ـ ١٠ قوتابی (٥ کوڕ و ٥ کچ)

**بابەتەکانی خوێندن**

لە قوتابخانەی هیزانی تێکەڵاو، وەکو قوتابخانەکانی دیکەی باشووری کوردستان و لە دوای ساڵی ٢٠٠٣بە زمانی سریانی، ئەو بابەتانەی لێ دەخوێندرێت: بیرکاری و زانست و کیمیا و فیزیا و زیندەوەرزانی کۆمەڵایەتی و وێنە و وەرزش و ئامۆژگارییەکانی مەسیح. هەروەها زمانی کوردی و عارەبی و ئینگلیزی.

**قوتابخانەی ئامادەیی**

قوتابیانی ئەو قۆناغەی خوێندن، کە ژمارەیان ٢٨ (١٤ کوڕ و ١٤ کچ) قوتابییە لە بینای قوتابخانەی بنەڕەتی، دەخوێنن. بەڕێوەبەری قوتابخانە مامۆستاییێکە بە ناوی خەنینیا خائل سامانۆ. مامۆستایەکانی دیکەی قوتابخانەکە ئەمانەن:

* جینان یۆنان ـ مامۆستای زمانی سریانی
* مونیر ئەنویە ـ مامۆستای بیرکاری
* نانی یوسف ـ مامۆستای کۆمەڵایەتی (کچە)

* یورِم یوارِش ـ مامۆستای وەرزش (پێش چوونم داوای یارمەتیم لێ کردبوو. مخابن کە چووم خۆی دزیەوە)

**گرفتەکانی خوێندن**

قوتابخانەی بنەڕەتی و ئامادەیی، وەکو هەر قوتابخانەیێکی دیکەی باشووری کوردستان، بێ گرفت نینە. هەندێك لە گرفتەکان ئەمانەن:

**١. کەمی مامۆستا**

ژمارەی مامۆستایەکان، بە ژمارە و پسپۆری، لە چاو ژمارەی پۆلەکان و بابەتەکان کەمە. ئەو گرفتە بە موحازەرە، چارەسەر کراوە.

**٢. دوو دەوامی**

بینای قوتابخانەی هیزان دوو دەوامی لێ دەکرێت. بەیانیان بۆ قوتابییەکانی قۆناغی بنەڕەتییە و پاش نیوەڕۆیانیش بۆ هی قۆناغی ئامادەییە.

**٣. شوێنی نیشتەجێبوون**

بینایەی قوتابخانەی هیزان خانووی بۆ مامۆستایانی دەرەوەی گوندی تیارییەکان هەیە. خانووەکە لەگەڵ بینای قوتابخانە دیواری حەوشەیان بەینە.

**٤. هینان و بردنی قوتابیان**

قوتابیانی گوندەکانی دەوروبەری هیزانێ، ترومبێلیان بۆ هینان و بردنیان، لە لایەن بزووتنەوەی ئاشووری، بۆ گیراوە. بەیانییان کاتژمێری حەوت و نیو بە دوایان دەچی دوای تەواوبوونی خوێندن بۆ ماڵەوەیان دەباتەوە.

**٥. کێشەی زمانی کوردی**

قوتابیی قۆناغی بنەڕەتی و ئامادەیی، کوردی خراپ دەزانن. هۆیەکەی، وەکو من دەیبینم، دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی نیگەتیڤانەی حزبە سیاسییەکان. ئەگەر وانەبێ ئەدی بۆچی پیاو و ژنانی بەتەمەن وەکو من و تۆ بە زارەکی بادینان لەگەڵ

کەسانی غەیرە تیاری دەدوێن. مامۆستای زمانی کوردیش، ئەگەر چی بەشی کوردی لە دهۆك تەواو کردووە، وەلێ پێویستی بە شارەزابوونی زێتر هەیە. هەر بۆیەش پێشنیار دەکەم بابەتی زمانی کوردی لێرە و لە شوێنەکانی هاوشێوە، بە مامۆستاییێکی بەڕەچەڵەك کورد بدرێت.

## شووکردن و ژن هێنان

کچ و کوڕ دوای ئەوەی بە یەك رازی دەبن، کەس و کاری کوڕە دێنە خوازبێنی کچە و لەسەر مارەیی و زێڕ و ناومالّ و جلوبەرگ رێك دەکەون. رۆژی گواستنەوە، بە ئارەزووی هەردوو لاوە بە لەبەر چاوگرتنی بارودۆخی هەر دوو خێزان، دیاری دەکرێت.

زاوا، دەچیتە دوو بووکێ و لە مالّەوە دەری دێنی و بەرەو کەنیسە سواری ئوتۆموبێلی دەکات. لەو رێیەدا چەند ئوتۆموبێلێ، کە خزم و کەس و برادەریان تێدایە، بەگەلّ دەکەوی.

بووك و زاوا، بۆ مارە بڕین، لە پێش قەشە دەوەستن و قەشەش دوای خوێندنی ئینجیل و دوعاکردن داوایان لێ دەکات کە تاکو لە ژیان ماون لەگەلّ یەك ڕاست بن و لە ناخۆشیدا یەکتر جێ نەهێلّن و سەردانی کەنیسە بکەن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی ژیانی هاوسەرێتی.

بێوەژنێك گەر نەیهەوێ لەسەر مندالّەکانی دابنیشی، ئەوە بۆی هەیە، مێرد بکاتەوە. وەلێ زۆربەیان دوای مردنی مێردەکانیان شوو ناکەنەوە. ڕەدووکەوتن لە نێو تیارییەکان نییە، لەبەر ئەوەی دایك و باوکی کوڕە و کچە، لە بەر دەم شووکردن و ژنهێنان، رێگر نین.

## فرەژنی

فرەژنــی لــە نــاو کۆمەڵگــەی تیارییــدا، لــە بــەر ئــەوەی لــە ئــاینی مەســیحی قەدەغەکراوە، نییە و کەسیش ئەو نەریتەی نەشکاندووە. وەلێ پیاوی تیــاری گــەر وجاغ کۆر بوو، واتە کوڕ و کچ ، لە ژنەکەی نەبوو، دەتوانی ژنێکی دیکە بێنی.

**شووکردن بە غەیری تیاری**

تیارییەکان وەك ئەوەی کچی خۆیان بە ئارەزووی خۆیان بە کوردان نــادەن ئــەوهاش کچ لە کوردان، ناخوازن. وەلێ هەندێ جار وا ڕێك دەکەوێ کە کچێکی تیــاری بــێ ڕەزامەندی دایك و باوك، وەکو ئەوەی چەند ساڵ لەمەو بەر لــە گونــدی خــەلیلانی رووی دا، شووی بە کوڕێکی هەرکی کرد.

**جلوبەرگی تیارییەکان**

جلوبەرگی ئەمڕۆکەی ژن و پیاو و کوڕ و کچ لە نێــو تیارییــەکانی دۆڵــی نــەهلێ، هەمان ئەوانەی کە پێیان دەگوترێت جلوبەرگی ئەوروپایی.

**ـ جلوبەرگی پیاوان**

پیاوی تیاری چاکەت و پــانتۆر و کــراس و فانیلــە و قەمــسەڵە و تــشێرت، لەبــەر دەکات. وەلێ ئەوانەی بۆ کارکردن لەبەر دەکرێن لە چاو ئەوانەی لە کاتی بێ کاری و سەردان و خۆشی، پێشتر زۆر لەبەر کراون.

جلوبەرگی ترادیسیۆنی، وەکو شال و شەپەکی قەیتانکراو و نەخــشێندراو و کــڵاوی جەمەدانی تێ ئارێندراو و پشتێنی گوڵدار و کەوشی جوان، لــە هەنــدێ خۆشــی و جەژن، ئەویش لای ژمارەیێکی کەم لە پیاوان نەبێت، نەماوە.

تیارییەکان، جودا لە ئەرمــەن و کلدانــەکانی باشــووری کوردســتان، بــە تایبــەتی ئەوانەی تەمەنیان لە چل ساڵ بەرەو ژێرتــرە، جلوبــەرگی کــوردی واتــە کورتــەك و شەرواڵ و پشتێن لەبەر ناکەن.

به درێژایی ئەو ماوەی لە ناویان ژیام، تەنیا دوو سێ پیاویانم بە جلوبەرگی کوردی بینی، ئەویش تەنیا شەرواڵیان لەبەر دابوو و بۆ کار بوو.

**ـ جلوبەرگی ژنان**

ژنی تیاری، کراس و فانیلە، یان پانتۆڵ و فانیلە، لەبەر دەکات. هەندێکیان، بۆ ئەوەی قژیان پەرت نەبێت و نێتەوە سەر چاویان، لەچکەییێك لەسەر دەبەستی و لە پشتەوە گرێی دەدات.

کراس و کەوێ و سوخمە و ئاوەڵ کراسی کوردی، لە نێو ژنانی تیاری، هەبوونیان نییە. لەمەشدا تیارییەکان لە ئەرمەن و کلدانەکان جودان.

**داب و نەریتی تیارییەکان**

تیارییەکان وەکو هەر نەتەوەییێکی دیکەی باشووری کوردستان، خاوەن داب و نەریتی خۆیتیان. من پێشتر باسی هەندێکیانم کردووە. لێرە تەنیا باسی نەریتێکیان دەکەم کە لە مانگی کانوونی یەکەمی هەموو ساڵێك دەیکەن و منیش، لە رێگەی خانەخێیەکەم، هاوبەشیم تێدا کرد. نەریتەکەش ئەوەی خوارەوە بوو.

**ـ گوشتییێ**

مەڕدارەکان سێ چوار مانگ بەر لە کانوونی یەکەم، دوو سێ سەر مەڕان بۆ گوشتێی دیاری دەکەن. لەو ماوەیەدا، بۆ ئەوەی قەڵەویان بکەن، لە وانی دیکە زێتر ئالیکیان دەدەن و ماندوویان ناکەن. لە کۆتایی تشرینی دووەم، مەڕەکان سەر دەبڕێن و گۆشتەکەیان، پارچەپارچە دەکرێت. بەشێکی، بۆ زستان، دەخرێتە یەخچاڵ. بەشەکەی دیکەی دەکرێتە گوشتییێ.

هەندێك گۆشتی نەرمك لە مەنجەڵێکی گەورە، بۆ کوڵاندن، داوێنە سەر ئاگری و دەستی لێ نادەن بۆ ئەوەی ئاوەکەی چرك بکات و لە چەورییەکەی خۆی

سووربېێتەوە ئینجا لە قاپی کانزایی پەل دەکرێ و لەگەڵ عارەق و بیرە و ترشیات و لیمۆن و نان و زەیتون و شتی دیکە، لە پێش پیاوان کە لە ژووری مێوانان، لەسەر رایخ و سفرە لە پێش دانیشتوون و لە پێش ژنان کە لە ژوورێکی دیکە کۆبوونەتەوە، دادەندرێت. ئینجا دەست بە خواردن و خواردنەوە دەکرێت. ناوەناوە، لەبەر ئەوەی گۆشتەکە چەورە و دونیاساردە، قاپەکە بە گۆشتەوە، دەخرێتە سەر سۆپای داری، بۆ ئەوەی گەرم ببێتەوە. لەگەڵ خواردنەوە، باس لە سیاسەت و هەر شتێکی دیکە، دەکرێت. پاش خواردنەوەی عارەق و بیرە و خواردنی گوشتیێ، برنج بۆ هەر سێ چوار کەس لە سینییێکی بچووك دەکرێت و سەری بە گۆشت دادەپۆشرێت. پاش خواردن، چا لە پیاڵە و کووپ دەکرێت. پاشان مێوانەکان هەڵدەستن و بۆ ماڵەکانیان دەچنەوە.

ئەم داب و نەریتەی تیارییان، لەو ساڵانەی دوایی، لەبەر سووك بوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، رەونەقی ساڵانی پێشووی نەماوە. ئەگەر جاران گشت خەڵکی ئاوایی بۆ خواردنی گوشتیێ بانگ دەکران، ئەمڕۆ تەنیا خزم و کەسی زۆر نزیك، نەبێ خەڵکی دیکە داوەت ناکرێت.

## بنەمای ئاینی تیارییەکان

تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ، سەر بە کەنیسەی رۆژهەڵاتی کۆنن. ئامۆژگارییە ئاینییەکەیان، وەکو مەسیحییەکانی دیکە، لە چەند نووسراوەی پیرۆز، بە نموونە، ئەوانەی خوارەوە، تۆمارکراون:

### ـ ئینجیل

چوار ئینجیل بە ناوەکانی: مەتی و مەرقوس و لوقا و یوحەنا، هەیە. ژیاننامەی یەسوعی مەسیح، بە درێژی لەو ئینجیلانە، نووسراوە. لەبەر ئەمە بایەخی تایبەتی خۆی لای مەسیحییەکان، هەیە.

- خوزرا

ئەم کتێبە ئاینییە بە زمانی ئارامی، ئەو زمانەی حەزرەتی ئیبراهیم قسەی پێ کردووە، لە سەردەمێکی زووی سەرهەڵدانی مەسیحییەت، لە لایەن کەنیسەوە، نووسراوە. ئەم کتێبە بریتییە لە پاڕانەوە (دوعا) و نوێژ و تەراتیل و مەزامیری داود و شتی دیکە.

**پایەیی ئاینی**

ئەم پایەیە، وەك ئەوەی لە ناو مەسیحییەکانی دیکە، ئەوهاش لەناو تیارییەکان، لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بەم شێوەیە:

**- بەتریارك**

یەکەم پایەیی ئاینییە، لە ناو پەیڕەوانی کەنیسەی ڕۆژهەڵاتی کۆن. هەر مەترانێك بیەوێت ببی بە بەتریارك، بە گوێرەی لێدوانەکەی قەشە ئەندریۆس، دەبی تەمەنی لە چل و پێنج بۆ پەنجا ساڵ بێت و لە لایەن چەند پیاوی ئاینی بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێررێت.

مار ئادی دووەم. بەتریارکی کەنیسەی ڕۆژهەڵاتی کۆنە لە باشووری کوردستان و شوێنی دیکەی جیهان. لە بەغداد دادەنیشی.

- مەتران

دووەم پایەیی ئاینییە لە ناو پەیڕەوانی کەنیسەی ڕۆژهەڵاتی کۆن. بۆ ئەوەی قەشەیەك ببێ بە مەتران دەبێ تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر نەبێ و ژنی نەهێنابێ.

مار تۆما گورگیس مەترانی ئەبرەشیەی موسڵ و دهۆك، لە شوێنی جوداجودا دەژی. بە مەبەستی پاراستنی ژیانی، مەترانییەکیان لە نێوان هیزان و خەلیلان، بۆ دروست کردووە. ئەو ڕۆژەی، بە مەبەستی پرسیارکردن چووبووم بۆ سەردانی، سەفەری کردبوو.

ـ قەشە

سێیەم پایەیی ئاینییە لە ناو پەیڕەوانی کەنیسەی رۆژهەڵاتی کۆن. بۆ ئـەوەی بـبی بە قەشە نابی تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر بێت. قەشە ژن دێنی. وەلیٚ ئەگـەر ژنـی هێنا بۆی نییە ببیٚ بە مەتران.

قەشە لە لایەن مەتران بۆ کەنیسە دیاری دەکرێت و مانگانەی (٣٠٠ هەزار دینار) پێدەدرێت. لەبەر ئەمە، بۆ بژێوی ژیان، چاوی لەکارکردن نییە. هەروەها رێکخراوە سیاسییەکان و خێرخوازەکان مـانگیٚ هەنـدێك پـارە (٢٠٠ هـەزار دینـار)ی پـیٚ دەدەن.

ئەو پایە ئاینییە، لە بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە تاکو ئەمڕۆ، لە دۆڵی نـەهلیٚ و لە کەنیسەی هیزانی، هەبووە و هەیە. قەشەکانی کـە لێـرە خزمـەتیان کـردووە ئەمانەن:

* خۆشابا ـ لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوو
* سەورۆ ـ لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو
* شەمعون ـ ساڵی١٩٩٠ ـ ٢٠٠٣
* ئەندریۆس - لە ساڵی ٢٠٠٣ تاکو ئەمڕۆ

بە مەبەستی شارەزابوون لە ژیانی ئاینی تیارییەکان لە پێنجـی تـشرینی دووەمـی سـاڵی دوو هـەزار و هەشـت، سـەردانی قەشـەی کەنیـسەی هیـزانم کـرد. ئـەو زانیارییانەی لە ئەنجامی وەڵامی پرسیارەکانم دەست کەوت، لە خوارەوە دەنووسم.

* ئەندریۆس میخائیل زەیا ( ناوی بنەماڵەکەی ـ تیاری)
* ٧ کانوونی دووەم ساڵی ١٩٥٦ لە دایك بووە.
* خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی مأمونیە لە شاری کەرکوك، تەواو کردووە.

* خوێندنی ناوەندی و دوا ناوەندی لە قوتابخانەی دواناوەنـدی سـریانی لـە شـاری کەرکوك، تەواو کردووە (هەردوو قۆناغەکە لە یەك بینایەدا بوون)

* سـاڵی ١٩٦٩ ـ ١٩٧٣قوتـابی ئـاینی بـووە، لـە قوتابخانـەی نـاو کەنیـسەی ڕۆژهەڵاتی کۆن لە کەرکوك.

* ساڵی ١٩٧٦ ـ ١٩٨٨ سەرباز بووە لە سوپای عیراق و لە بەرەی شەڕدا بووە.

* ساڵی ١٩٨٨ کراوە بە قەشە.

* ساڵی ٢٠٠٣ تاکو ئەمڕۆ، قەشەیە لە کەنیسەی هیزانێ.

**ـ شەماشە**

چوارەم پایەیی ئاینییە لە نـاو پـەیڕەوانی کەنیـسەی ڕۆژهـەڵاتی کـۆن. شەماشـە لەگەڵ قەشەدا، هاوبەشی لە ڕێوڕەسمی ئاینی دەکـات. کـوڕ بـۆی هەیـە بـبێ بـە شەماشە. کچ بۆی نییە، ئەم پۆستە ئاینییەی وەربگرێت. وەلێ دەتوانی ببیتە یەك لە ئەندامانی جەوقی کەنیسە بـۆ نوێـژ و جـەژن و بۆنـەی دیکـە. شەماشـەکانی کەنیسەی هیزانی، ئەمانەن :

* تیڤان ئەویتەڕ

* جبرائیل مەنسور

* داود هورمز

* یۆخنا ئیشایا

مانگانەی شەماشە ٥٠ هەزار دینارە. نوێژکەر و خێرەومەند، دوای نوێژ و جەژن و ناخۆشی، لە جیاتی خوێندن، هەر یەکە، ئەوەندەی دەستی لێ دەبێتـەوە، هەنـدێك پارە، بە قەشەکان دەبەخشن. قەشەکان، لەبەر ئەوەی پارەکەیان بەشی ژیانی ڕۆژانە ناکات، ئیشی دیکە، بە نموونە، مامۆستایەتی، دەکەن.

### نوێژ لای تیارییەکان

تیارییەکان وەکو مەسیحییەکانی دیکە، رۆژێ سێ جار نوێژ دەکەن، کاتی نوێژەکانیش، ئەمانەن:

* بەیانیان (کاتژمێری ٧ ـ ٨ بەیانی)

* ئێواران (کاتەکەی بە گوێرەی وەرزەکان دەگۆڕێت، بە نموونە لە زستاندا ٤ ـ ٥ پاش نیوەڕۆ)

* شەوان (دوای ١٢ شەو تاکو بەیانی)

پێش نوێژکردن ناقوس بە ریتمێکی تایبەت، بۆ ماوەی سێ چرکە لێ دەدرێت. خەڵك لە کەنیسە کۆدەبێتەوە و لەسەر تەختە دوو مەترییەکان کە لە ژوورەکە ریزکراون دادەنیشن و گوێ بۆ قەشە شل دەکەن.

قەشە تەختەکی بڵندی لە پێشە ئینجیل دەخوێنی و لە یەزدان و مەسیح دەپاڕێتەوە و جەوق (١٠ ـ ١٥ کوڕ و کچ ) لە تەنیشتی بە پۆشاکی کەنیسەیی وەستاون و هەندێك لە قسەکانی قەشە دەگێڕنەوە.

### کەنیسەکانی دۆڵی نەهلێ

گوندەکانی هیزانێ و کەشکاوا و رەبەتکێ، کەنیسەی خۆیان هەیە. وەلێ کەنیسەی هیزان نەبێ ئەوانی دیکە قەشەی خۆیان نییە. لەبەر ئەوە قەشەی هیزان، هەر یەك شەممەیەك، لە یەك لەو کەنیسانە قوداسی ئاینی دەگێڕی و بە گوێی مردووەکانی ئەو گوندانە لە کەنیسەکانی خۆیان دەخوێنی و بەردەوام سەردانی هەر یەك لەو کەنیسانە دەکات.

### ناشتنی مردوو

تیارییەکان مردووەکانیان، دەشۆرن و بە قوماشی سپی کفنی دەکەن. وەلێ ئەوانەی دەکوژرێن، لەبەر ئەوەی پێیان وایە بە خوێنی خۆیان شۆراون، ناشۆرێن و کفن

ناکرێن و بە جلکی بەریان، لە گۆڕیان دەنێن. بە دارەبازە، بۆ سەر گۆڕستان هەڵی دەگرن. کە گەیشتنە نزیك گۆڕستان دارەبازەکەی دەسووڕێنن و لەسەر زەوی دایدەنێن. ئینجا دەری دێنن و روو لە رۆژهەڵات و لەسەر پشت و دەستی راستی خراوەتە سەر دەستی چەپی، دەینێژن.

پێش ناشتن و دوای ناشتن، نوێژ لەسەر مردوو دەکرێت. نوێژەکانیش ئەمانەن :

* نوێژی مردووان (صلات الاموات) ـ ئەو نوێژە دوای مردن و کفن کردن، لە سەر مردووان دەخوێندرێ.

* نوێژی ماڵ ئاوایی (صلات الوداع)

* نوێژی ناشتن (صلات الدفن) ـ ئەو نوێژە دوای ناشتن لە لایەن شەماشە، لەسەر گۆڕی مردووەکە، دەخوێندرێ. لەو رێورەسمەدا، کەس و کار و خەڵکی گوند، بە دەوری گۆڕەکە، جەم دەبن. دوای تەواوبوونی نوێژ خوێندن، خەڵك بەرەو کەنیسە دەگەڕێنەوە.

**گۆڕستانی ناوچەکە ئەمانەن:**

* گۆڕستانی هیزان ـ مردووەکانی گوندەکانی هیزان و ژولێ و خەلیلان، لەو گۆڕستانە، دەنێژرێن.

* گۆڕستانی کەشکاوا ـ مردووەکانی گوندی کەشکاوا، لەو گۆڕستانە، دەنێژرێن.

* گۆڕستانی بلمەنت ـ مردووەکانی گوندی بلمەنت، لەو گۆڕستانە، دەنێژرێن.

* گۆڕستانی مێرۆکێ ـ مردووەکانی گوندی مێرۆکێ، لەو گۆڕستانە، دەنێژرێن.

* گۆڕستانی چەم رەبەتکێ ـ مردووەکانی گوندی چەم رەبەتکێ، لەو گۆڕستانە، دەنێژرێن.

**تازیە و سەرەخۆشی**

تازیەکە بۆ ماوەی سێ رۆژ دەخایەنی. لە رۆژی یەکەمدا، تەنیا پیاوان، لە رۆژی دووەم و سێیەم پیاو و ژن، بۆ سەرەخۆشی دەچن. لە رۆژی دووەمدا نوێژی عەسرێ

(صلات العصر) دەکرێ و کاتژمێری پێنجی ئێواری خواردن دەکرێ و لە کەنیسە بە یادی مردووەکە، دەخورێ. لە رۆژی سێیەمدا، قوربانی دەکەن و سریمۆنا (قـوداس) ی دەکەن و ئینجیل و دوعای بۆ مردووەکە، دەخوێنن.

خەرجی تازیە گرانە، هەر بۆیەش تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ لەسـێیەم رۆژی تازیـە، بە مەبەستی باروبۆکردنی تازیەدار، پارەی کۆدەکەنەوە. هەر کەسـێك بـە گـوێرەی توانای خۆی و دوور و نزیکی لە مردووەکە. بـە نموونـە، تیارییـێك پێـی گـوتم لـە تازیەی گوندی دە هەزار دینار دەدات. وەلێ ئەگەر خزم بێت ئەوە دەیکات بە پەنجا هەزار دینار.

**جەژن و یادەوەرییەکانی کەنیسەیی (٣)**

تیارییەکان، جەژن و یادکردنەوەیان هەیە. وەلێ کاتەکان لەبەر ئەوەی پەیڕەوی لـە رۆژژمێری کۆن (رۆژژمێری کۆن لـە سـەردەمی یولیـۆس قەیـسەر، لەبـەر ئـەوەی هەڵـەی حیـسابی تـێ کـەوتبوو، سـیازدە رۆژی بـۆ زیـادکراوە)، لەگـەڵ هـی مەسیحییەکانی دیکە، چەند رۆژی جیاوازە.

**یەکەم. جەژنەکان (الاعیاد)**

ساڵ لە کانوونی دووەم تاکو کانوونی یەکەم، ئەو جەژنانەی تێدایە

٦ کانوونی دووەم ـ جەژنی دنح (عید الدنح)

١٦ مارت ـ جەژنی سەعانین (عید السعانین)

٢٠ مارت ـ جەژنی فەسح (عید الفصح)

٢٣ مارت ـ جەژنی زیندووبوونەوە (عید القیامة) (٤)

٢٤ مارت ـ دووەم رۆژی زیندووبوونەوە (ثاني یوم العید)

١ مایس ـ جەژنی سەرکەوتن (عید الصعود)

١١ مایس ـ جەژنی فەنتیقستی (عید الفنطیقسطي)

٢٩ حوزەیران ـ جەژنی نوسردیل (عید نوسردیل)

٦ ئاب ـ جەژنی تەجەلی (عید التجلی)

١٣ ئەیلول ـ جەژنی خاچ (عید الصلیب)

٢٥ کانوونی یەکەم ـ جەژنی لەدایکبوونی یەسوعی مەسیح (عید میلاد یسوع المسیح)

**دووەم. یادەوەرییەکانی کەنیسەیی (التذکارات الکنسیة)**

ساڵ لە کانوونی دووەم تاکو کانوونی یەکەم، ئەو یادەوەرییانەی تێدایە

٢ کانوونی دووەم ـ یادەوەری مار زەیا تۆباوی (تذکار مار زیا الطوباوي)

٤ کانوونی دووەم ـ یادەوەری مریەمی عەزراء (تذکار مریم العذراء)

٧ کانوونی دووەم ـ بەڕۆژووبوونی عەزاری (صوم العذاري)

١١ کانوونی دووەم ـ یادەوەری مار یوحنا معمەزان و مار پەترۆس و پولس و چوار ئینجیلییەکان (تذکار مار یوحنا المعمذان و مار بطرس و بولس و الانجیلیین الاربعة)

١٤ کانوونی دووەم ـ بەڕۆژووبوونی نەینەوا (صوم نینوی)

١٨ کانوونی دووەم ـ یادەوەری مەلافنەکانی یۆنان و سریان (تذکار الملافنة الیونان و السریان)

٢٥ کانوونی دووەم ـ یادەوەری مار استیفانوس شەهید و مار ئاوا جاسالیق (تذکار مار اسطیفانوس الشهید و مار آوا الجاثالیق)

٢٧ کانوونی دووەم ـ یادەوەری مار بنیامین جاسالیقی شەهید (تذکار مار بنیامین الجاثالیق الشهید)

١ شوبات ـ هەینی مردووان (جمعة الموتی)

٣ شوبات ـ بەڕۆژووبوونی گەورە (الصوم الکبیر)

٢٧ شوبات ـ ناوەڕاستی بەڕۆژووبوونی گەورە (منتصف الصوم الكبير)

١٤ مارت ـ هەینی چلەمین (جمعة الاربعين)

٢١ مارت ـ هەینی مەزن (جمعة العظيمة)

٢٢ مارت ـ شەممەی رۆناکی (سبت النور)

٢٨ مارت ـ هەینی موعتەریفین (جمعة المعترفين)

٣٠ مارت ـ شەممەی نویێ و یادەوەری مار موشی (الاحد الجديد و تذكار مار موشي)

٣١ مارت ـ یادەوەری مار ئۆراهام (تذكار مار اوراهام)

٦ نیسان ـ یادەوەری مار عەبد یشوع (تذكار مار عبد يشوع)

٧ نیسان ـ یادەوەری رەبان هورمزد (تذكار ربان هرمزد)

٢٠ نیسان ـ یادەوەری مار ئەدی (تذكار مار ادی)

٢٤ نیسان ـ یادەوەری مار گیورگیسی شەهید (تذكار مار كوركيس الشهيد)

٢٥ نیسان ـ یادەوەری مار سەرکیس و مار باکوس (تذكار مار سركيس و مار باكوس)

٤ مایس ـ یادەوەری مار دانیال تەبیب (تذكار مار دانيال الطبيب)

٦ مایس ـ یادەوەری پیرۆزە شمونی و منداڵەکانی ( تذكار القديسة شموني واولادها)

١٥ مایس ـ یادەوەری مریەمی عەزراء (تذكار مريم العذراء)

١٦ مایس ـ هەینی زێڕین (جمعة الذهب)

١حوزەیران ـ یادەوەری مار میلس و مار ئیبن قوسری (تذكار مار ميلس و ابن قوسری)

٢٧ حوزەیران ـ یادەوەری قوتابیانی حەفتاو دوو (تذكار التلاميذ الاثنا والسبعون)
٣ تەموز ـ یادەوەری مار تومای نێردراو (تذكار مار توما الرسول)
٤ تەموز ـ یادەوەری مار یەعقوبی نسێبینی (تذكار مار يعقوب النصيبيني)
٣١ تەموز ـ یادەوەری مار یوسف خنانیشوع (تذكار مار يوسف خنانيشوع)
١٥ تەموز ـ یادەوەری مار قریاقوس و دایکی یولیتی (تذكار مار قرياقوس و امه يوليطي)
١ ئاب ـ یادەوەری پیرۆزەی شەمونی و منداڵەکانی (تذكار القديسة شموني و اولادها)
٧ ئاب ـ رۆژی شەهیدی ئاشووری (يوم الشهيد الآشوري)
٨ ئاب ـ یادەوەری مار شەمعون بر سباعی (تذكار مار شمعون برصباعي)
١٥ ئاب ـ یادەوەری مریەمی عەزراء و مار قرداغ شەهید (تذكار مريم العذراء و مار قرداغ الشهيد)
٣ تشرینی یەکەم ـ یادەوەری مار ئیلیای نەبی (تذكار مار ايليا النبي)
١٥ تشرینی یەکەم ـ یادەوەری مار میخائیل هاورێ مەلائکە (تذكار مار ميخائيل رفيق الملائكة)
٢٥ تشرینی یەکەم ـ یادەوەری مار بسیون شەهید (تذكار مار بثيون الشهيد)
٣ تشرینی دووەم ـ یادەوەری مار کورکیس شەهید (تذكار مار گورگيس الشهيد)
٧ تشرینی دووەم ـ یادەوەری مار ئۆتین تۆباوی (تذكار مار اوطين الطوباوي)
١٥ تشرینی دووەم ـ یادەوەری مار عەبد یشوع و گشت قدیسەکان (تذكار مار عبد يشوع وجميع القديسين)
١٩ تشرینی دووەم ـ یادەوەری مار یەعقوب مقەتەع (تذكار مار يعقوب المقطع)

## بەشی چوارەم

## بنەمای سیاسی تیارییەکان

تیارییەکان، تێکەڵاوی نەتەوەکانی دیکەن، بە تایبەتی کورد، لە ژیانی سیاسی باشووری کوردستان، بووینە. هاوبەشییان لە شۆڕشەکانی کورد کردووە. قوربانییان لە پێناوی مافی مادی و رۆشنبیری و یەکسانی لە دەسەڵات داوە. تەرحیل کراون. پایەی حزبییان لە ناو حزبە کوردییەکان، بە تایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، وەرگرتووە.

تیارییەکان، ئەوڕۆکە، لە چەندین حزب و رێکخراوی سیاسی، وەکو کوردی ئەوهاش ئاشووری، کاردەکەن. ئێمە لە خوارەوە، باسی ئەوانە دەکەین، کە بە ژمارە و چالاکی سیاسی، لە وانی دیکە، لەبەر چاوترن.

**بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری (الحركة الديمقراطية الآشورية)**

بزووتنەوەی ناوبراو، لە ساڵی ١٩٧٩دا، لە لایەن کۆمەڵێك کەسانێکی سیاسی ئاشوورییەکان، دامەزراوە. بەرەبەرە ئەندامی لە ناو تیارییەکانی وەکو عەشیرەتەکانی دیکە، زیاد دەکەن و ئەندامانی حزبەکانی دیکەی باشووری کوردستان، بەرەو کەمی دەچن. بە نموونە، لە ناو ٣١ خێزان لە گوندی کەشکاوا، وەکو پێشتر باسم کردووە ٢٤ یان سەر بەو حزبەن.

سکرتێری بزووتنەوەی ئاشووری پیاوێکە بە ناوی ئۆنادم کەننا (ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق) و ئۆگەر ئۆراها بەردەستی (مقر) دەکات.

**پارتی دیموکراتی کوردستان (الحزب الديمقراطي الكردستاني)**

ژمارەییێك لە تیارییەکان وەکو خەڵکی گوندەکانی دەوروبەریان، چەندین ساڵە لە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە هیوای ژیانی باشتر بۆ گەلانی باشووری کوردستان، کار دەکەن. پایەیی حزبی هەندێکیان، گەیشتە ئەندامی ناوچە و

بەرزتر. وەلیٚ ژمارەیان لە ناو ئەو حزبە، بە گوێرەی قسەکانی یەك لە ئەندامە کۆنەکان، لەبەر پشتگویٚ خستنی پیاوی دڵسۆز و وەفادار و لە خۆگرتنی کۆنە مستەشار و جاش و خۆ رەپێشکردنی خەڵکانی دووڕوو و بە زمان و پاداش نەدانەوەی، وەکو پێویست، پێشمەرگەکانی دێرین و لە بەڵێندان و جێبەجیٚ نەکردن وەرس بوون و پەیدابوونی حزبی نەتەوەیی، بە نموونە، بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری، تیارییەکان لە پارتی دیموکراتی کوردستان، دوور دەکەونەوە و گەنجەکانیان روو لە حزبە ئاشووری و عێراقی دەکەن و ژمارەشیان تاکو دیٚ کەم دەبیٚ. بە نموونە، لە کۆی ٣١ ماڵی گوندی کەشکاوا، تەنیا ٧ ماڵیان پارتین.

بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان، لقی ١٨ ناوچەی نەهلە لە خانووی سێیەمی ریزی یەکەمی خانووە تازەکانی نزیك گۆڕستانی هیزانە. ئەو شوێنە حزبییە لە رۆژی پێنج شەممە رێکەوتی ٢٧ تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨، لە نێو گوندی تیارییەکانی دۆڵی نەهلیٚ کراوەتەوە. بەرپرسی ئەم لقەی پارتی عمانوئێل ولیەم هیزانی یە.

تیارییەکان، جگە لەو حزبانەی، کە باسمان کردن، لە هەندیٚ رێکخراوی، کە لە لایەن هێزەکانی سیاسی باشووری کوردستان دروست کراون و پشتگیرییان لیٚ دەکەن، بە نموونە، ئەوانەی خوارەوە، کاردەکەن.

**مكتب الكداني ـ السرياني ـ الآشوري**

سەرۆکی ئەو رێکخراوە، کەسێکە بە ناوی جەمیل زەیتۆ و یەك لە کوڕەکانی مالك خۆشابا بە ناوی شەمزدین، جێگرێتی. بارەگایەکی سەرەکی ئەو رێکخراوە، لە شارۆچکەی زاخۆی سەر بە ئەستانی دهۆکە.

**لجنة شؤون المسيحيين**

رێکخراوی ناوبراو، لە لایەن فەرەنسۆ ئۆدیشو، سەرۆکایەتی دەکرێت. یەك لە بارەگایەکانی سەرەکی وەکو ئەوەی پێشوو، لە گەڕەکی حي الملايين لە شارۆچکەی زاخۆی سەر بە ئەستانی دهۆکە.

## تەرحیلکردنی تیارییەکان

تیارییەکان وەکو کورد، بە دەستی عێراق، لە شوێنەکانی خۆیان بۆ شوێنی دیکە و دیارکراو، تەرحیل کراون و دوای ئاڵوگۆڕی سیاسیش لە دەسەڵاتدارێتی عێراقدا لە ساڵی ٢٠٠٣دا، بە دەستی لەشکری ئەمریکا و هاوپەیمانانیان، هەندێکیان بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕاونەتەوە و بەشێکیشیان دەستیان لە شوێنی تازە بەرنەداوە. بەشێك لە تەرحیلکراوەکان، لەبەر بێ ئاوی و نە بوونی ئیش و خانوو و قوتابخانە و لە ژیانی شار راهاتن و هەبوونی خانوو لە کۆمەڵگاکانی زۆرەملێ، بۆ گوندەکان، نە گەڕاونەتەوە.

تیارییەکانی ناوچەی توێژینەوە، بە تایبەتی خەڵکی گوندی کەشکاوا، دوای لە گوند دەرچوون، روویان لە چیای شوشێ کرد و لە ئەشکەفتەکەی گیرسانەوە. کە سوپای عێراقیش لە ناوچەکە پاشەکشەی کردووە، بەرەو چیای تاتا کەوتوونەتە رێ و لێرەشەوە بۆ چیای دەریا باڵا ملیان ناوە.

گوندی کەشکاوا، بە گوێرەی قسەکانی یەك لە خەڵکی گوند، لە نێوان دە تاکو پازدەی مایسی ساڵی ١٩٨٧دا، بە شۆفەری عێراقی لە گەڵ عەرد تەخت کراوە. خەڵکەکەیان بە زیل بۆ ئاکرێ گواستەوە. لە شوێنێك بە تەنیشت بینایەی قایمقامی ئاکرێ، هەڵڕشت و نزیکەی نۆ رۆژان، بە بێ هیچ شتێك لەو ناوە دەخولانەوە.

شوێنی کۆمەڵگای قادسیەی سەدام، کە ئێستاکەش بە ناوی کۆمەڵگاکانی زۆرە ملێ لە لایەن خەڵکەوە و گەڕەکی ئازادی لە لایەن شارەوانییەوە، ناو دەبرێ. بۆ تەرحیلکراوان، بە مەبەستی دروستکردنی خانوو (دوو ژوور و هۆڵ و حەمام و ناندین و ئاودەستخانە)، دەستنیشان کراوە. هەر خێزانێك ٢٤٠ مەتری چوار گۆشەی پێ دراوە و پارەی شیش و بلۆك و چیمەنتۆ و بەننا و کرێکاریش لە لایەن

تەرحلیکراوەکان، دابین کراوە. ئەو گەڕەکە ئێستاکە، بە هۆی دروستکردنی خـانوو بـەرە و دوکـان و بینایـەیی جۆراجـور، پـەرەی سـاندووە و گـەورە بـووە. وەلـێ زەوییەکانی نێوان ئەو کۆمەڵگا زۆرەملێیە و شارۆچکەی ئاکرێ، هێشتا، بینایـەی لێ نەکراوە.

تیارییەکان، وەکو نەتەوەکانی دیکەی باشووری کوردستان، بـە نموونـە کـورد، بـە دەستی عێراق، تووشی مەینەتی هاتوون. ئێمە لێرەدا، بەسەرهاتی یەك لەو سەدان کەسانە، کە بۆ زیندانەکان، راپێچ کراون، دەگێڕینەوە.

خانەخێیەکـەی منیـان، لـە ١٦ ئـابی سـاڵی ١٩٨٨دا، دەسـتگیرکرد و رەوانـەی گرتووخانەی حطین ـ لە نێوان دووبز و کەرکوك ـ یـان کـرد. لێـرە وەکـو خـەڵکی دیکە، لە رێگـەی پیـاوانی ئیـستخبارات و ئـەمن و حزبـی بـەعس، مێـشکیان شووشتووتەوە. وەلێ دوای ماوەیێك، لە رێگەی ئەفسەرێکەوە، ئـازاد کـراوە و بـۆ لای خێزانەکەی، گەڕاوەتەوە.

## تیارییەکان و زێبارییەکان

تیارییەکان لە ئەنجامی شەڕی نێوانیان لەگەڵ زێبارییەکان، لە سـییەکانی سـەدەی بیستەم، لە سەر کوشتنی شەماشە یوخنا، روویان لە ناوچەی سلیڤانی کرد و دوای چوار ساڵ، بۆ شوێنەکانی خۆیان گەڕانەوە.

تیارییەکان، پێیان وایە، لە لایـەن هەنـدێ زێبـاری، تـەنگاو کـراون و دەسـت بـۆ زەوییەکانیان درێژ دەکـەن و ئاویـان لـێ دەگرنـەوە و ماڵاتیـان لـە پاوەنـەکانیان دەلەوەرێنن. بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە سـکاڵای خۆیـان بـە نووسـین داوەتـە، کاربەدەستانی دەوڵەت و بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئـاکرێ. وەلـێ، بە گوێرەی بۆچوونەکانی خۆیان، گرفتەکانیان بۆ چارەسەر نەکراوە.

## تیارییەکان و بارزانییەکان

پەیوەندی نێوان ئەو دوو عەشیرەتە، بۆ سەرەتای سییەکانی سەدەی بیست دەگەڕێتەوە. هەندێك لە تیارییەکان، نەوەکو هەر دەستی یارمەتییان بە هاوبەشییان لە شۆڕشەکانی بارزان کردووە، بەڵکو بارزانییەکان، متمانەی تەواویان بە تیارییەکان کردووە. بە نموونە، مەسعود بە منداڵی شیری خێزانی موختاری چەمە سنێی خواردووە. کەوابێ لەگەڵ کوڕ و کچەکەی ئەو ژنە بە شیر خوشك و بران.

مستەفا بارزانی، لەگەڵ دوو کەسی دیکەی بارزانی، بەر لە دەست پێکردنی شۆڕشی بارزان لە ساڵی ١٩٤٥دا، سەردانی شاری موسڵی کوردستانیان کردووە. لەوێندەر بە دوای ماڵك خۆشابای ناردووە. وەلێ ئەوەیان لەبەر نەساغی، نەیتوانیوە لە ماڵەکەی خۆی دەرچێ. هەنگێ مستەفا بارزانی بۆ لای ماڵك خۆشابا دێت و لەسەر ناحەقییەکانی عیراق بەرامبەر کورد بە گشتی و ناوچەی بارزان بەتایبەتی، دەکەونە قسەکردن. ماڵك خۆشابا دەپرسی: ئایا وڵاتێکی گەورەی وەکو بەریتانیای مەزن یان ئەمریکا، پشتگیری خۆیان نیشان داوە؟ نەخێر، وەلێ بە عەشیرەتەکانی کورد پشت قایم. کەوابێت لە زیان بەولاوە هیچی دیکەی بە دواوە نایێت.

ناکۆکی نێوان عەشیرەتی بارزانی و زێباری، ناکۆکییێکی لە مێژینەیە. زۆر جار، بە رێگەی ژن خواستن و خێرخوازان، هەوڵی چارەسەرکردنی دراوە. بە نموونە، لە یەك لەو هەولانەدا، لە ساڵی ١٩٦٢ مستەفا بارزانی ماڵك خۆشابای، بۆ لای وەزیری ناوخۆی عێراق (ئەحمەد محەمەد یەحیا)، وەکو شاهید بردووە. لەو کۆبوونەوەیەدا مەحمود ئاغای زێباری، لە وێندەر بووە.

دوای بەسەرچوونی دوو ساڵ بەسەر شۆڕشی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١دا، شاندێکی کوردی، کە لە جەلال تاڵەبانی و سالح یوسفی و عەگید حاجی شەعبان پێکهاتبوو،

به مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد لەگـەڵ عێراقـدا، سـەردانی بەغـدا، دەکات. لە وێندەر فوئاد عارفیان بەگەڵ دەکـەویت. شـاندەکە، ئـارەزووی دیـتنی مالك خۆشابا دەکات. وەلێ ماڵەکەیان پێ نـەزانیوە. پیـاوێکی تیـاری نەناسـراو (دوایی دەرکەوتووە پیاوی موخابەراتی عێراق بووە) یان بەگەڵ کەوتووە.

مالك خۆشـابا، لەبـەر ئـەوەی پێـشتر ئاگـاداری پەیوەنـدیی ئـەو پیـاوە لەگـەڵ موخابەراتی عێراقی بوو، جگە لـە قـسەی سـەرپێیی وەکـو ئێمـە عێـراقین نـابی ناکۆکی لە نێوانمان هەبی و پێویستە کێـشەکانمان، بـە گیـانی برایـەتی چارەسـەر بکەین و لێك ببوورین ... هتد. دواتر، مالك خۆشابا شاندەکەی ئاگادار دەکاتەوە، تیارییەکان وەکو میللەت هاوکاری شۆڕشی ئـەیلولییان پـێ نـاکرێ. وەلـێ گفـتی گشت یارمەتییان، سـەربازی و ئـابووری و حەوانـەوە و چـەك هـەڵ نـەگرتن دژی شۆڕش، پێ دەدات. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە تیارییەکان لەگەڵ پێـشمەرگەکانی دیکـەی کوردسـتان، لـە بـەرەکانی شـەڕدا بـوون و پلـەی سـەربازی و حزبییـان، هەبوو.(٥)

پەیوەندی بارزانییان و تیارییەکان، لەو ساوە تاکو ئەمڕۆ سـارد نەبووتـەوە، واتـە. بـە بتـەوی ماوەتـەوە، بـە نموونـە، کـاك مەسـعود بـارزانی، سـەرۆکی هـەرێمی کوردستان، لە نامەیێکی تایبەتدا (دەقەکەی لە خوارەوە نووسراوەتەوە) بەو شـێوە خەم و پەژارەی خۆی بۆ مردنی یوسف مالك خۆشابا، دەربڕیوە.

| پارتی دیموکراتی کوردستان | الحزب الديمقراتي الكردستاني |
|---|---|
| سەرۆك | الرئيس |

الاخ العزيز پولص يوسف المحترم

تحية طيبة

بمزيد من الحزن والالم تلقيت نبأ وفاة والدكم المغفور له (يوسف ملك خوشابا) رئيس العشائر التيارية.

بهذه المناسبة الاليمة اتوجه لسيادتكم وعموم العائلة والشعب الآثوري بأحر التعازي والمواساة، مبتهلا الى الله تعالى طالبا منه الغفران للفقيد الراحل والعمر المديد لسيادتكم.

ان لله وانا اليه راجعون

مسعود بارزاني

٢٠٠٨/٢/٢٠

## سەرچاوە و تێبینی

١) زانیاری لەسەر چۆنییێتی نیشتەجێکردنی تیارییەکان، لە زۆر سەرچاوە دەست دەکەوێت. بە نموونە، ئەمانەی خوارەوە

- جرجيس فتح الله. نظرات في القومية العربية مدا وجزرا حتى العام ١٩٧٠ تاريخا وتحليلا اضواء على القضية الآشورية (مذابح آب ١٩٣٣) الجزء الرابع المأساة الآشورية. الطبعة الاولى اربيل - ٢٠٠٤
- جي. كيلبرت براون. قوات الليفي العراقية ١٩١٥ - ١٩٣٢. الترجمة والتحقيق: د. مؤيد ابراهيم الونداوي. مراجعة: رفيق صالح. بنكەی ژين السليمانية - ٢٠٠٦
- رياض رشيد ناجي الحيدري، الآثوريون في العراق ١٩١٨ - ١٩٣٦
- عبدالرزاق الحسني. تاريخ الوزارات العراقية. طبعته السابعة الموسعة والمزيدة. دار الشؤون الثقافية العامة، ١٩٨٨ الجزء الاول والثاني

٢) عەبدوڵڵا غەفور. گوندەکانی کوردستان، گوندەکانی باشووری کوردستان لەسەرژمێری دانیشتوانی عیراقدا ـ ١٩٧٧، بەرگی سێیەم. چاپی یەکەم، هەولێر ـ ٢٠٠٥ ل ١٠٦ - ١١٢

٣) ٢٠٠٨ تقويم كنسي حسب طقوس كنيسة المشرق الآثورية بغداد ـ العراق. مطبعة كنيسة المشرق ـ بغداد (بلا تاريخ)

٤) جەژنی ناوبراو لە ٢٣ی مارت دەست پێدەکات و سێ ڕۆژان دەخایێنی. وەلێ گشت تیارییەکان، لەبەر جیاوازی کەنیسەیان، لە یەك کاتدا، جەژن ناکەن. بە نموونە، ئەوانەی سەر بە کەنیسەی ئاشووری ڕۆژهەڵاتی کۆن (لە گوندی کەشکاوا حەوت خێزان سەر بەو کەنیسەن)، حەوت ڕۆژ پێش ئەوانی دیکە، جەژن دەکەن.

٥) چاوپێکەوتن لەگەڵ پولص یوسف مالك خۆشابا ڕێکەوتی ١٢/٥/٢٠٠٨ لە گوندی بابلۆ.

## دەرئەنجام

دەرئەنجامی توێژینەوە مەیدانییەکەم، لەسەر تیارییەکانی دۆڵی نەهلێ لە قەزای ئاکرێ و لە خاڵەکانی خوارەوە، دەخەمە بەرچاو.

١. نیشتەجێبوونیان لە دۆڵی نەهلێ، بۆ ساڵانی سەدەی بیستەم، دەگەڕێتەوە.

٢. ئاووهەوای شوێنی نیشتەجێبوونیان، لە زستان سارد و لە هاوین فێنکە.

٣. خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوە، بە ئاو و لەوەڕو دارو بارە.

٤. ژمارەی دانیشتوان، لەبەر کۆچکردن بۆ دەرەوەی ناوچەکە کەم و زیاد دەکات.

٥. خانووەکان، دوای ئاوەدانکردنەوە، سەرتاپییان بە بلۆك و سیمەنت، دروست کراونەتەوە. گرفتی نیشتەجێبوون، نییە.

٦. کێشە لەسەر زەوی، لەبەر ئەوەی هەر جووتیارێك، خاوەن تاپۆی خۆیەتی، نییە.

٧.کشتوکاڵی هاوینە، بەتایبەتی برنج و باوە. بەشێکی زۆر لـەزەوی بـۆ باخـچەی سێو و هەرمێ و لادراوە.

٨. بەخێوکردنی مەڕوماڵات، لەبـەر هـەبوونی لـەوەڕ لەدەشـت و چـیایەکاندا زۆر باوە. وەلێ ژمارەیان لەبەر دەست هەڵگرتن لە بەخێوکردنیان و رووی لە کەمییە.

٩. بنەمای کۆمەڵایەتی تیارییەکان، لە مالك و رەبیس و موختار، پێکهاتووە.

١٠. زمانی خوێندن، لە سایەی یاسای خوێندن، لەباشووری کوردستاندا، جگە لـە کوردی و ئینگلیزی و عارەبی و بەسـریانییە. رێـژەی خۆێنـدەوار، لـە سـەرجەمی دانیشتواندا، لە زیادبووندایە.

١١. پایەی ئاینی لەناو تیارییەکان، وەکو مەسیحییەکانی دیکە، لـە سـەرەوە بـۆ خوارەوە بەو شێوەیەیە: بەتریارك، مەتران، قەشە، شەماشە.

١٢. سریمۆنیای ئاینی، بەتایبەتی هی یەکشەممان، لەبەر ئەوەی هەر یەکەو قەشەی خۆی نییە، هەر هەفتەی لەیەك لـە کلیـساکانی دۆڵـی نـەهلێ دەکـرێ. کلیـسەی هێزان و شوێنی نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی قەشەی دۆڵی نەهلێ یە.

١٣. تیارییەکان، وەکو مەسیحییەکانی دیکە، ئاهـەنگی لـەدایکبوونی حـەزرەتی مەسیح دەگێڕن و لە کلیسەکان یادی پیاوچاکانی ئاینی مەسیحی دەکەنـەوە. لـەو رۆژانەدا خێروخێرات دەکەن و سەردانی یەکتر دەکەن.

١٤. شووکردن و ژن هێنان، ئارەزوومەندانەیە. فرەژنی نییە.

١٥. جلوبەرگی تیارییەکان، بریتییە لە هی ئەوروپایی . جلوبـەرگی ترادیـسیۆنی، مەگەر لە جەژن و شاییان نەبێ، لەبەر ناکرێ و بەزۆری نەماوە.

١٦. زۆربەی داب و نەریتەکانی، دەیان ساڵ لەمەوبەر، لەبەر ئاڵوگۆڕی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی، بەتـەواوی پـەیڕەوییان لێ نـاکرێ. لەگـەڵ ئەوەشـدا، مـەڕدارەکان دەستیان لە نەریتی گوشتییێ، هەڵنەگرتووە.

١٧. ڕێکخراوەی سیاسی، بەتایبەتی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و بزووتنـەوەی ئاشووری، کاری سیاسی خۆیان لەناو تیارییەکان دەکەن.

**ڕاسپاردەکان**

ڕاسپاردەکانم، بۆ باشتر کردنی ژیان لە ناوچەی تۆێژینەوە و بەندکردنی گیانی تیارییەکان بەخاکی باشووری کوردستان، ئەمانەی خوارەوەن:

١. دابینکردنی ترۆمبێلی گشتی بۆ هاتوچۆی ڕۆژانە لەنێوان گونـدەکانی ناوچـەی لێکۆڵینەوە و شارۆچکەی ئاکرێ.

٢. قیرتاوکردنی جادەی نێوان گوندی کەشکاوا و شارەدێی نەهلێ.

٣. دروستکردنی عەنبارئاوێك لە گەلی دوبرێ، بۆ گلدانەوەی ئاوی رووبـاری خـازر بۆ ئاودان و پەرەپێدانی کشتوکاڵی هاوینە.

٤. پاراستنی دارستان لە بڕینی بێ ویژدانانە.

٥. دامەزراندنی مامۆستایەکی کورد لە قوتابخانەی بنەڕەتی و ئامادەیی هێزان بـۆ گوتنەوەی زمانی کوردی.

٧. باشترکردنی دەزگای تەندروستی.

٧. پتەوکردنی برایەتی و تەبایی و هاوبەشی خاك لە نێوان کورد و تیارییەکان.

٨. هەوڵدان بۆ گۆڕینی هەڵوێستی نیگەتیڤانەی تیارییەکانی نیشتەجێی ئەوروپا، بەرامبەر بە کورد و کوردستان.

## ملخص البحث

# تياري وادي نهله

## دراسة ميدانية في اثنو – جغرافية

د. عبدالله غفور

جامعة صلاح الدين ــ أربيل/ كلية الاداب ــ قسم الجغرافية

ان البحث الذي اجريته على تياري وادي نهله ضمن ناحيتي دينارتة التابعة لقضاء عقرة و ناحية جمانكي التابعة لقضاء عماديه في محافظة دهوك هي حصيلة الدراسة الميدانية التي قمت بها وعلي نفقتي الخاصة خلال شهري مارت وكانون الثاني من عام الفين وثمانية.
يتناول البحث بايجاز جغرافية المنطقة من حيث الموقع والمناخ والثروة المائية المتمثلة بنهر خازر وبريشو والغطاء النباتي. درست الى جانب ذلك ، الجوانب الاقتصادية للتياريين من بينها الزراعة (ملكية وايجار الارض والمحاصيل الزراعية ومشكلاتها ومعالجاتها) والثروة الحيوانية (انواع الحيوانات وطرق تربيتها ومشكلاتها ومعالجاتها) والصناعات اليدوية القليلة المتبقية . ركزت تركيزا خاصا على الحياة الاجتماعية للتياريين من بينهما عشائر (تياري السفلى والعليا وتخوما وجيلو وباز) والطبقات الاجتماعية (مالك وريس ومختار) التعليم ( عدد الهيئة التدريسية والتلاميذ ومشكلة التعليم ومعالجتها) والدين ( بطريارك ومطران وقس وشماس والصلات والاعياد ) وبعض العادات و التقاليد (الزواج والطلاق ودفن الموتى والتعزية) والملابس. أوليت النشاط السياسي اهتاما كبيرا، لما له من ارتباط وثيق بين الكرد والتياريين . تحدثت عن الحزب الديمقراطي الكردستاني والحركة الديمقراطية الاشورية والمكتب الكلداني – السرياني – الاشوري – ولجنة شؤن المسيحيين وترحيل التياريين وعلاقتهم بجيرانهم الكرد. اختتمت البحث بالاستنتاجات والاقتراحات وذكر بعض المصادر لمن يرغب البحث في التاريخ المعاصر للتياريين. البحث الميداني، حسب تصوري، يقدم خدمة كبيرة لدراسات اثنو - جغرافية لجنوب كردستان ويكون حافزا لدراسات اوسع واشمل .

# ABSTRACT

## The Tiyari Tribe of Nahla Valley: An Ethno-geographic Field Study

**Dr. Abdullah Ghafur**
Department of Geography
College of Arts Salahaddin University - Erbil

This is a field study of the Tiyari people of Nahla Valley who dwell in Dinarta sub-district of Aqra district and Jimanki sub-district of Amadiyia district of Duhok Governorate. The study is conducted at the private expense of the researcher in January and March 2008.
The researcher briefly tackles the geography of the area; its location، climate، the water sources represented by Khazir and Brishou rivers، and the plantation cover. In addition to these، the economic aspect of the Tiyari people such as agriculture (land ownership and land renting، the agrarian product، its problems، and its solutions) and the fauna of the area (types، methods of breeding them، their problems، and their solutions)، together with the few handicrafts remained there are put under focus. The main focus is on the social life of the Tiyari people and especially the Tiyari tribes (the High Tiyari، the Low Tiyari، Tichoma، Ghilou، and Baz)، the social strata (the owner، the chief and the village guardian). Education (the teaching staff، the learners، its problems، and its solutions) and religion and religious aspects (the patriarchs، the bishops، the saints، the deacons، main prayers and religious feasts) are tackled in details. Some customs and traditional ceremonies such as marriage، divorce، dead burial and funerals and the native clothes of

the people are dealt with as well. The political activity of the area is of great concern since there is a strong relationship between the Kurds and the Tiyaris. Kurdistan Democratic Party، Assyrian Democratic Movement، the Chaldo-Syrian-Ashur and the Christian Affairs Committee Tiyari Migration are focused on، with reference to their relationship with their Kurdish neighbors.

The study ends with conclusions and recommendations and a bibliography for those who are interested to study the contemporary history of the Tiyaris. This field study will be a great contribution to the ethno-geographic study of the Southern Kurdistan and will be an impetus for further studies in this field.

# الآثار الكردية في المكتبة القادرية

**أ. د. عماد عبدالسلام رؤوف**
جامعة صلاح الدين –أربيل/ كلية الاداب – قسم التاريخ

**يضم جامع السيد الشيخ عبدالقادر الكيلاني في بغداد مكتبة غنية بالكتب المخطوطة والمطبوعة، وضع نواتها الأولى القاضي أبو سعد المبارك المُخَرِّمي (ت ٥١٣هـ)، وهو مؤسس المدرسة التي نسبت إلى اسمه أولاً، ثم تحولت إلى المدرسة القادرية، وتعهدها بالعناية والزيادة السيد الشيخ عبدالقادرالكيلاني نفسه، ثم أولاده من بعده، حتى نمت واتسع نطاق ما تحتويه من كتب شتى، وزاد فيها العديد من أهل العلم[١]، منهم أبو الحسن علي بن عساكر ابن المرحب بن العوام البطائحي المقرئ النحوي (٤٨٩-٥٧٢هـ) قال ياقوت "ووقف كتبه على مدرسة الشيخ عبدالقادري الجيلي"[٢]، وفعل مثله الشيخ أبو الحسن مرتضى الحارثي المقدسي المتوفى سنة ٥٧٢.**

**وكان للنكبات العديدة التي توالت على هذه المدرسة دور مؤلم في بعثرة كتبها، وتشتت ما في خزانتها من موقوفات العلماء والنقباء والسراة. وفي القرن الثاني عشر، بعثت خزانة الكتب القادرية من جديد، بعد إحياء مدرستها العلمية، فنهض نقباء بغداد، من ذرية الشيخ الكيلاني، باغنائها بكل ما يقتنونه من الكتب والرسائل، وكان للسيد علي القادري نقيب الأشراف أثر كبير في هذا المجال، فقد وقف جملة ضخمة من نفائس الكتب على المدرسة القادرية، وذلك في العقد الثامن من القرن الثاني عشر الهجري، ولا تزال طائفة من تلك الكتب محفوظة في المكتبة حتى اليوم.**

ومن الذين تعهدوا خزانة الكتب هذه بعنايتهم السيد رمضان القادري نقيب الأشراف (المتوفى سنة ١٢٢٥هـ)، فقد وقف عليها كتباً ورسائل عديدة، لا يزال بعضها موجوداً إلى الآن.

ومنهم أيضاً السيد سلمان بن السيد علي القادري نقيب الأشراف (المتوفى سنة ١٣١٥هـ)، حيث ما تزال جملة وافرة من كتب الخزانة ممهورة بختمه، وكان قد بذل في سبيل جمع تلك الكتب الشيء الكثير من المال والجهد، حتى أنه كان يلجأ في كثير من الأحيان إلى استكتاب ما يعثر عليه من مخطوطات في حال عدم تمكنه من اقتنائها، وكان يصحح هذه النسخ بنفسه، ويقابلها على أصولها بكل عناية وتدقيق.

وممن عني بهذه الخزانة السيد عبدالرحمن القادري الكيلاني نقيب الأشراف، ورئيس أول حكومة عراقية في العصر الحديث (المتوفى سنة ١٣٤٥هـ) فقد كان له ولع عجيب بجمع الكتب، حديثها وقديمها، مخطوطها ومطبوعها، ينفق عليها الكثير من ماله، وكان يراسل الخطاطين في مصر والشام والمغرب واستانبول لينسخوا له الكتب التي يريدها، كما أنه كان يستحضر كميات كبيرة من ورق الترمة وغيره من الصين والهند، لتسد حاجة النساخ في بيته، فجمع مكتبة خاصة بقي منها الآن ما يربى على (٨٠٠) مجلد مخطوط، و(٤٠٠٠) مجلد مطبوع، وجعلها وقفاً على المكتبة القادرية، ثم تولى الأستاذان يوسف بن عبدالله الكيلاني وبرهان الدين بن عبدالرحمن الكيلاني نقلها إلى قاعة خاصة في الطابق العلوي من الحضرة القادرية، كانت ـ من قبل - غرفة ومعتكفاً للسيد عبدالرحمن النقيب، وعملا على تنظيمها وإغنائها بالكتب، وفتحت لأول مرة للمطالعين سنة ١٩٥٤، وأصبحت مكتبة عامة يؤمها طلاب العلم وأهل البحث من كل حدب وصوب.

واستمرت الجهود مبذولة نحو توسيع هذه المكتبة من كل الوجوه، فضمت إليها الغرف المجاورة لها، وزيد في عدد كتبها، ووفرت فيها من المصادر والمراجع ما يعز الحصول عليه وتعظم الحاجة إليه. وفي عام ١٩٦٥ شرع ببناء قاعة جديدة متسعة للمطالعة، وخصصت للمطالعين من الباحثين وطلبة الدراسات العالية، كما أضيفت قاعة أخرى لمطالعة النساء. وافتتحت المكتبة بمبانيها الجديدة وقاعاتها في سنة ١٩٦٧، ولبث تؤدي مهمتها الجليلة في خدمة البحث العلمي حتى اليوم.

وعند القيام بالتوسعة الأخيرة، والشاملة، للحضرة القادرية، منذ أواخر العقد الأخير من القرن الماضي، شيدت للمكتبة قاعات كبيرة المساحة، وفرت فيها كل مستلزمات المكتبات العصرية المتطورة، وخصصت لجمهور الباحثين والعلماء وطلبة الدراسات العليا[٣].

ومن الملاحظ أن في خزانة الكتب هذه، مخطوطات مهمة عديدة وقفها أهل الفضل والعلم على المدرسة القادرية، في شتى الأعصار والأمصار، من بينهم ملوك، وسلاطين، وأمراء، وعلماء أعلام، وغيرهم. ومن الكتب ما وقف على غير هذه المدرسة أصلاً، من مدارس بغداد ومساجدها القديمة، ثم انتقلت إلى المدرسة القادرية حفاظاً عليها ورغبة في استمرار انتفاع الناس بها، بعد اندثار خزائن تلك المؤسسات وتفرق مخطوطاتها أيدي سبأ.

ومما يلفت النظر، أن هذه المكتبة الغنية، احتوت - فيما احتوت - على جملة وافرة من المخطوطات التي ألفها علماء نابهون، أو نسخها وزوقها نساخ وخطاطون مجودون، أو وقفها مالكون صالحون، من الكرد، في خلال القرن الأربعة الأخيرة، وهي تلقي ضوءاً كاشفاً على أهمية تلك الفئات الكردية المثقفة، وطبيعة اهتماماتها الثقافية والعلمية والفنية، إبان تلكم الحقبة الطويلة من الزمن. وتتباين الوسائل التي آلت بها هذه الكتب إلى المكتبة القادرية، فهي أما أهداها مؤلفوها إلى المكتبة مباشرة، و انتقلت من مالك إلى

آخر حتى آلت إليها في عهد من العهود، وسنحاول في هذا البحث أن نستعرض آثار أولئك المؤلفين، والنساخ والخطاطين، والمتملكين والواقفين، على النحو الآتي:

**المؤلفون:**

١- إبراهيم بن حسن بن شهاب الدين السهراني الكوراني الشهرزوري، برهان الدين، ابو اسحق (ت١١٠١هـ): محدث، فقيه، ولد في سوران (سهران)، وسمع الحديث بالشام ومصر والحجاز، وأقام في المدينة المنورة حتى وفاته، وله مؤلفات عديدة، أكثرها في الحديث واللغة والعقائد(٤). له في المكتبة:

أ- (الأمم لإيقاظ الهمم)، وهي في مصطلح الحديث، ذكر فيها أسانيده ومن روى عنهم، ويتضمن أسماء طائفة كبيرة من علماء الشام والحجاز من مشايخه في القرن الحادي عشر للهجرة، وفيها نبذ من تراجمهم. قال في أولها " الحمد لله الأول والآخر، فمنه بدئ وإليه منتهى... أما بعد فهذا الأمم لإيقاظ الهمم يتضمن رفع أسانيد الصحيحين والسنن الأربعة وما تيسر من كتب الحديث وغيره على وجه الإختصار". وفي آخر المخطوطة تعليقة أرخ فيها أحدهم ولادة المؤلف بسنده، فقال" وقد رأيت بخط ملا عباس القاضي، اخي الأستاذ ملا عبدالكريم، عن ملا أبي بكر المصنف، على ظهر كتاب الأنوار في فقه الشافعية، وكان تلميذ عمي ملا حسين بن شهاب الدين، والأنوار لعمي: ولد إبراهيم بن حسن في شهر شوال سنة ١٠٢٥". وهذه النسخة حسنة، وهي بخط نسخ معتاد. وتقع في ٣٩ ورقة، ٢٥ سطراً، ٢٢×١٥سم. (العدد ٢٠٨).

ب- مطالع الجود بتحقيق التنزيه في وحدة الوجود. رسالة دافع فيها عن آراء محيي الدين ابن عربي (ت٦٣٨هـ) في وحدة الوجود، وحاول إثبات أنها لا تؤدي إلاّ إلى تنزيه الله تعالى. أولها " الحمد لله الواسع الحكيم، عالم الغيب

والشهادة، العزيز الحكيم.. أما بعد فقد أخبرنا شيخنا العارف بالله صفي الدين أحمد بن محمد المدني". نسخة بخط النسخ على يد علي بن مرجان سنة ١١٢١هـ، وهي ضمن مجموعة تشغل منها الأوراق ١٠-٦٢، ١٥ سطراً، ٢٠×١٥سم (العدد ٧٣٠).

وهذه النسخة حسنة، وهي بخط نسخ معتاد. وتقع في ٣٩ ورقة، ٢٥ سطراً، ٢٢×١٥سم. (العدد ٢٠٨).

ج- رسالة في تفسير قوله تعالى (يكاد زيتها يضيء). قال في أولها "الحمد لله رب العالمين، وصلى الله على سيدنا محمد النبي.. أما بعد، فقد ذكرت أيدك الله تعالى في كتابك أن البيانيين مثلو للغلو المذكور في فن البديع بقوله تعالى: يكاد زيتها يضيء ولم لم تمسسه نار". وفي آخره "قال المؤلف قدس الله سره: تم تسويده ليلة الأحد رابع عشر صفر سنة ١٠٩٧". تشغل الرسالة الأوراق ١٤٣-١٤٤، من مجموعة، ٢١ سطراً، ٢٠،٥×١٣سم (العدد ١٤٤٢).

د- رسالة فيمن أدرك الإمام. أولها "الحمد لله الأول والآخر، الباطن والظاهر.. أما بعد، فقد تكرر سؤالكم عن المسبوق إذا أدرك الإمام راكعاً..". وآخره " قال مؤلفه الكوراني: تم تسويده يوم الخميس ٤ محرم ١٠٨٣". وهذه الرسالة ضمن المجموعة السابقة.

٢- أحمد أفندي بن الشيخ محيي الدين مصطفى، أبو السعود (٨٩٦-٩٨٢هـ). مفسر، فقيه، من أهل العمادية، نبغ في العلوم، حتى صار قاضي عسكر الأناضول، ثم اختير شيخاً للإسلام، وهو مفتي الدولة العثمانية، مدة ثلاثين سنة، في عصر السلطان سليمان القانوني وابنه السلطان سليم الثاني[٥]. وله مؤلفات في الأدب والفتيا، وله في المكتبة:

أ- إرشاد العقل السليم إلى مزايا الكتاب السليم، وهو تفسير للقرآن الكريم على مذهب النعمان، بيضه سنة ٩٧٣، وأهداه إلى السلطان سليمان القانوني،

فنال قبوله، واشتهر صيته وانتشرت نسخه في الأقطار، وشرحه كثيرون. وهذه القطع من تفسيره، هي:

● نسخة ناقصة الأول والآخر، تبدأ بتفسير سورة التوبة، وتنتهي بتفسير سورة يوسف، وهي بخط معتاد، يرقى إلى القرن الثاني عشر، أهداها إلى المكتبة القادرية السيد يوسف الكيلاني متولي الأوقاف القادرية سنة ١٣٩٢هـ. ٢٠٧ ورقات، ٢٥سطراً، ٢٧×١٧ سم (العدد ٨٥)

● نسخة كتب عليها أنها الجزء الثالث من التفسير، وهي تبدأ بتفسير أول سورة الكهف، وتنتهي بآخر سورة الملائكة. وهي بخط معتاد، ترقى إلى القرن الثاني عشر، وفي آخرها خروم، أضاعت تاريخ نسخها، وهو " أواخر شعبان.. من شهور ألف و...وعشر..". ٣١٤ ورقة، ٢٣ سطراً، ٢٢،٥×١٦سم. (العدد ٨٦).

● نسخة كتب عليها أنها الجزء السابع، وهي تبدأ بتفسير أول سورة الروم، وتنتهي بآخر سورة محمد (ص)، وهي كسابقتها من حيث الخط والورق. ٢٤٠ ورقة، ٢٣ سطراً، ٢٢،٥×١٦سم. (العدد ٨٧).

ب- الفتاوى. وهي مجموعة من الفتاوى، في فروع فقه الحنفية، باللغة التركية، مرتبة على أبواب كتب الفقه، تبدأ بكتاب الزكاة، وتنتهي بكتاب الدعوى. قال في أوله "الحمد لله رب العالمين، والصلوة والسلام على سيد المرسلين محمد خاتم النبيين، وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد سعادتلي سلطانم..". وهذه النسخة مكتوبة بخط نستعليق، وتاريخ نسخها سنة ١١٣٠هـ. وتشغل الأوراق ١-٥٠، ٣٢ سطراً، ٢٦ × ١٥،٥سم (العدد ٣٥٣).

٣- صبغة الله بن إبراهيم بن حيدر بن أحمد الحيدري الحسين آبادي (ت ١١٨٧هـ). من كبار علماء ماوران[٦]، ومنها انحدر إلى بغداد، بطلب من واليها أحمد باشا، فصار كبير علمائها، واشتغل بالتدريس حتى وصف بـ(علامة

العراق بل علامة عصره على الإطلاق)[٧]. له مؤلفات عدة في التفسير والعقائد[٨]، منها في هذه المكتبة:

أ- (حاشية على أنوار التنزيل) اقتصر فيه على تفسير سورة الفاتحة، وأنوار التنزيل وأسرار التأويل لناصر الدين البيضاوي، وأوله " الحمد لله الذي أنار من محض الفضل والجود حواشي عالم الإمكان بنور الوجود..". وهذه المخطوطة كتبها عبدالرحمن بن فيض الله، بخط النسخ الجيد، وفرغ منها في ٥ ذي القعدة سنة ١١٨٤هـ. وتقع في ١١٠ ورقات، ٢١ سطراً، ٢١×١٤سم (العدد ٧٧). وفي المكتبة مجموعة من نبذ في تفسير القرآن الكريم، لعلها منقولة من حاشيته المتقدمة، كتبت في حياته، لأنها موقعة بعبارة (صبغة الله مد ظله)، وقد كتبت في جداول على نحو مائل، بخط التعليق الجيد، وتشغل الأوراق ١-١٠، ٢١×١٢سم، من المجموع ذي (العدد ١٤٤٣). وثمة فائدة في تفسير آية من سورة البقرة منقولة من كلام صبغة الله المذكور، في الأوراق ١-٩٩ من مجموعة (العدد ١٤٢٨).

ب- رسالة في مدح بعض الوراء. بالفارسية، بخط تعليق، على شكل مائل، الورقة ١٢ من المجموعة (العدد ١٤٤٣).

ج- رسالة في تحقيق زيادة الصفات. وهي في الدفاع عما أورده مسعود بن عمر بن عبد الله التفتازاني (ت ٧٩٣هـ) في مسألة تحقيق زيادة الصفات، من مسائل علم الكلام والعقائد، كتبها بطلب من والي بغداد الوزير أحمد باشا (١١٣٦-١١٦٠هـ). أولها "الحمد لله المتصف وجوباً بكل ما أمكن له من صفات الكمال". نسخة بخط النسخ، والتعليق، وبشكل مائل، وتشغل الأوراق ١٣-١٤ من المجموعة (العدد ١٤٤٣). وتوجد في المجموعة المذكورة نسخة أخرى من هذه الرسالة، بالخط والهيئة نفسها، تشغل الأوراق ١٥ - ١٦ منها.

٤- إبراهيم فصيح بن صبغةالله بن محمد أسعد الحيدري (١٣٠٠هـ). عالم كبير، تولى نيابة القضاء ببغداد، سافر إلى استانبول، وتداخل هناك في

شؤون السياسة، حتى صار له شأن كبير فيها، ثم عاد إلى بغداد وفيها توفي، له مؤلفات عديدة في تاريخ بغداد ومدن عراقية أخرى، وفي التفسير والحديث والفلك والاسطرلاب والنحو وغير ذلك[٩]، وله في المكتبة

أ- (الرسالة الجفرية)، وهي في علم الجفر، وقال في أولها "الحمد لله رب العالمين، والصلوة والسلام على سيدنا محمد خاتم الأنبياء والمرسلين. أما بعد، فهذه فريدة في بيان قاعدة جفرية جليلة تتعلق بعلم النقطة، وقاعدة أخرى عجيبة ليس لها تعلق بذلك لخصتها من الكتب الصعبة المأخذ للطالبين". وهذه الرسالة لم يشر إليها مترجموه، وهي بخطه، كتبها بالمدادين الأسود والأحمر، وتتخلل النسخة جداول خاصة بعلم الرمل، وهي ضمن مجموعة وقفها على المدرسة القادرية السيد يوسف العطا مدرسها. وتشغل الرسالة الأوراق ١٣-١٨، ١٦ سطراً، ٢٢×١٧،٥سم (العدد ١٣٢١).

ب - ترشيح اللسان في علم البيان. قال في أولها "الحمد لله الذي خلق الإنسان علمه البيان، .. أما بعد فيقول أفقر العباد إلى مولاه، السيد فصيح ابن السيد صبغة الله الحيدري البغدادي، عفى عنهما الغفور الهادي: لما رأيت الكتب المؤلفة في علم البيان صعبة الفهم على المبتدئين من الصبيان، خطر ببالي أن أرتب كتاباً صغير الحجم، سهل العبارة، جامعاً لأقسام المجاز والكنية والاستعارة، مع ذكر الأمثلة وبيان علاقات المجاز". لم تشر مصادر ترجمته إلى هذه الرسالة، والمخطوطة بخط معتاد، يظهر أنه لمؤلفها نفسه، وهي من كتب السيد العطا الموقوفة على المكتبة القادرية. وتقع في ٦ أوراق، ٢٠-٢١ سطراً، ٢٢×١٩سم (العدد ١٠٨٥).

٥- حسن بن محمد بن علي بن بابا رسول الحسيني البرزنجي السعداني (لعلها: السهراني) الشهرزوري الشافعي (ت ١١٧٢هـ). له في المكتبة حاشية على حاشية إبراهيم بن محمد الأسفرائيني، عصام الدين (ت ٩٤٤هـ) على رسالة الاستعارات لأبي القاسم السمرقندي الليثي (ت بعد ٨٨٨هـ). قال في أوله،

بعد البسملة " قوله والمراد منه، أي من أروى إلى آخرالفقرة ق بمكان ي". والنسخة بخط معتاد، تم نسخها في ذي الحجة سنة ١١٨٣، وهي من كتب يوسف العطا الموقوفة على المكتبة القادرية. وتقع في ١١ ورقات، ٣٠ سطراً، ٢٢×١٣،٥سم. (العدد ١٠٥٠). وتوجد في المكتبة نسخة أخرى من هذه الرسالة

٦- أبو بكر بن سوار الكردي الشنامي، من علماء القرن الثاني عشر للهجرة، وترجمته غير معروفة، وتوجد له رسالة في المكتبة، عنوانها (حاشية على شرح الآداب العضدية)، والشرح لعلي بن محمد القوشجي الحنفي، علاء الدين (ت ٨٧٩هـ) على (آداب البحث) لعضدالدين عبدالرحمن بن أحمد الإيجي (ت٧٥٦هـ)[١٠]. ذكر في مقدمته أنه ضم إلى حاشيته فوائد من كلام عبد الله بن حيدر الحيدري (ت١١٠٧هـ) في شرح الرسالة المذكورة. أوله " حمداً لمن وضع كل شيء وقدره تقديرا، وشكراً لمن صنع كل صنيع وصدره تصديراً". والمخطوطة بخط نسخ معتاد، كتبها محمد أسعد بن محمد أمين أفندي المدرس ببغداد، وفرغ منها في ٢٣ ربيع الأول سنة ١٢٢٩". وعليها تمليك للسيد عبدالرحمن القادري نقيب الأشراف ببغداد. وهي تقع في ٣٢ ورقة، ٢١سطراً، ٢١×١٥سم (العدد ١٨٧).

٧- أبو بكر محمد الهوادي الميرستمي، عالم كردي غير معروفة ترجمته، ولكنه عاش في القرن الثالث عشر للهجرة. له مؤلفات في علم (الوضع)، منها في المكتبة القادرية.

أ- كتاب (خلاصة الوضع)، وأوله الحمد لله الذي دل على وجود استحالة الدور وامتناع تاثير الأثر اللاحق في مؤثره السابق". والكتاب بخط نسخ معتاد، ترقى إلى عصر المؤلف، وعليها شروح مختلفة منقولة من كلام المؤلف نفسه، ومذيلة بلفظ (منه)، ويقع في ٥ أوراق، ١٥سطراً، ٢٢×١٥سم (العدد ٨٨٤).

ت- نهاية الوسع لشرح خلاصة الوضع. شرح فيه كتابه (خلاصة الوضع) المتقدم. أوله "الحمد لله بديع الصنع، وعلى نبيه الصلاة ليوم الخفض والرفع، وبعد فهذا نهاية الوسع لشرح خلاصة الوضع، خصه الله باليمين والنفع".. والنسخة بخط نستعليق، كتبها ملا عبدالستار بن علي سنة ١٣٢٦هـ، وعليها حواش وتعاليق بخطه، وتقع في ٩ أوراق، ١٤ سطراً، ٢١ × ١٤،٥سم. (العدد ٨٨٥).

ج - بنان البيان. وهو في علم البيان، قال في أوله " الحمد لمن ليس ابتداء ألوهيته أيساً، والشكر لمن ليس انتهاء الوهيته ليساً، .. وبعد فنقول: علم البيان وأصول وقواعد تتعلق بإظهار المراد وبيان المعنى الواحد بتراكيب مختلفة". منه في المكتبة نسختان، الأولى بخط نستعليق، مكتوبة سنة ١٣٣٢هـ، وتقع في ٦ أوراق، ١٥ سطراً، ٢٢ × ١٦سم. (العدد ١٠٨١). والنسخة الأخرى بخط النسخ، غير مؤرخة، ولكنها ترقى إلى القرن الثالث عشر، عليها حواشي لبعض العلماء. وتقع في ١١ ورقة، ٩ سطور، ٢٢ × ١٤سم. (العدد ١٠٨٢). ولكتاب (بنان البيان) شرح ليوسف سنان بن احمد بن الحاج عبد السلام (القرن الثالث عشر)، سماه (تاج البيان المرصع بدرر مسائل علم البيان)، وأهداه إلى السيد عبدالرحمن بن السيد علي القادري نقيب الأشراف سنة ١٢٧٧هـ. والمؤلف معاصر لأبي بكر الميرستمي، وقد وصفه بـ(علامة الزمان)، ويقع هذا الشرح، وهو بخط مؤلفه، في ٣٣ ورقة، ١٧سطراً، ٢٢ × ١٦سم (العدد ١٠٨٣).

٤-أحمد بن حيدر بن أحمد الحيدري الحسين آبادي الشافعي، من الأسرة الحيدرية الشهيرة في ماوران، كان حياً بعد سنة ١١٠٠هـ، ولم يذكر أحد من مترجميه تاريخ وفاته، ولكن عصام الدين عثمان العمري (١١٣٤-١١٨٤هـ) أشار في كتابه (الروض النضر) أنه رآه في صغره[11]، فيكون قد ولد في أول القرن الثاني عشر في أقل تقدير. له في المكتبة القادرية:

حاشية على شرح إبراهيم بن محمد بن عرب شاه الأسفرائيني (ت٩٤٤هـ) على رسالة الاستعارات للسمرقندي. أوله "الحمد لله الذي ألهمنا دقائق المعاني وحقائق البيان، وأكرمنا بوثايق المباني ورشايق التبيان، فأرشدنا بهما إلى معرفة إعجاز القرآن". فرغ من تأليفه في يوم الإثنين ٢٣ رمضان سنة ١١٠٠، بخط النسخ، كتبه عبد السلام بن محمد سعيد الشواف، وفرغ من نسخه في ٨ ربيع الأول سنة ١٢٥٦هـ، ضمن مجموعة يشغل منها الأوراق ٤٧ - ٧٤، ٢١سطراً، ٢١×٥،١٥سم (العدد ١٠٤٩).

٩- أحمد بن حيدر بن محمد بن حيدر بير الدين (القرن الحادي عشر). أخذ العلم عن أسرته، واكب على التدريس والتأليف، توفي في قريته ماوران في زمن غير محدد[١٢]، له في المكتبة: المحاكمات. في علم المنطق، وهو حاشية على شرح العقائد العضدية لمحمد بن أسعد الصديقي الدواني (ت ٩١٨هـ) على العقائد العضدية، والعقائد العضدية للقاضي عضدالدين عبدالرحمن بن أحمد الإيجي (ت ٧٥٦هـ). قال في أوله " كيف لا أحمد لمن تتالت من فضله الآلاء.. وبعد فهذه تعليقات بل تنبيهات على تحقيقات مختفية في صفحات شرح العقائد العضدية للعلامة.. محمد بن أسعد الصديقي الدواني". توجد منه في المكتبة نسخة حسنة، بخط تعليق جيد، ترقى إلى القرن الثاني عشر للهجرة، تقع في ١٢٠ ورقة، ١٧سطراً، ٥،١٩ × ٥،١٠سم (العدد ٥٧٢). وتوجد منه نسخة أخرى، نفيسة، مجدولة، كتبت بالنسخ البديع، وحشيت هوامشها على ترتيب جميل، بشرح الدواني، وحاشية حيدر بن أحمد الحيدري على الشرح المذكور، وقد تملك هذه المخطوطة، السيد علي القادري نقيب الأشراف سنة ١١٨٨هـ. ووقفتها على المدرسة الخاتونية مؤسستها السيدة عاتكة خاتون سنة ١٢١٥هـ (العدد ٥٧٣). وتوجد نقول من هذا الكتاب ضمن مخطوطة (حاشية على تحرير القواعد المنطقية) تأليف علي بن محمد بن علي الحسيني الجرجاني الحنفي، المعروف بالسيد الشريف

(ت ٨١٦هـ). وقد وقفت المخطوطة السيدة عاتكة خاتون على المدرسة الخاتونية سنة ١٢١٥هـ.(العدد ٨١٨).

٨- إسماعيل بن إبراهيم بن حيدر الحيدري. من علماء الحيدرية في القرن الثاني عشر[١٣]. له في المكتبة رسالة هي حاشية على حاشية القرباغي في علم المنطق، والأخير هو يوسف بن محمد جان القرباغي المحمد شاهي (ت ١٠٣٥هـ)، والشرح لحسن كاتي، حسام الدين (ت ٧٦٠هـ). قال في أولها " هذه تنبيهات أوردها الفاضل إسماعيل الحيدري على هذا الكتاب، وعليه التوكل في كل الأمور، إنه الجواد الكريم الرحيم. الإصطلاح اتفاق قوم". والنسخة بخط معتاد، كتبت في حياة المؤلف، تملكها السيد يوسف العطا سنة ١٣٠٢هـ، وتقع في ٢٤ ورقة، ٢٥سطراً، ٢١×١٥سم. (العدد ٨٠١).

٩- حيدر بن أحمد الحريري بن حيدر الحيدري الحسين آبادي الشافعي (١٠٣٦-١١٢٩هـ)، من علماء ماوران[١٤]. وكان عالماً مدرساً مصنفاً له مؤلفات أكثرها شروح وحواش في العقائد والمنطق.

له في المكتبة:

أ- حاشية كتبها على حاشية حبيب الله بن عبدالله الدهلوي العلوي، شمس الدين ميرزا جان (ت٩٩٤هـ) على حاشية علي بن محمد الجرجاني، السيد الشريف (ت٨١٦هـ) على شرح محمد بن مبارك شاه البخاري لكتاب (حكمة العين) للكاتب القزويني (ت ٧٦٥هـ).في علم المنطق. قال في أوله "الحمد لله الموجد لجميع الموجودات، الشاهد على وحدانية جميع الذرات.. وبعد فقد كنت علقت فيما مضى على بعض المواضيع من الحاشية المنسوبة إلى .. مولانا ميرزا جان الواقعة على تعليقات المولى المدقق علي الجرجاني قدس سره في شرح حكمة العين لمولانا محمد بن مبارك شاه البخاري". وفي آخرها أنه فرغ من تأليفها سنة ١١٠٧هـ. والنسخة بخط دقيق الحروف، كتبها أحمد الغريب لأجل عيسى أفندي، وفرغ منها في آخر شهر رجب سنة ١١٧٨هـ، وقد

أهداها إلى المكتبة القادرية السيد يوسف الكيلاني سنة ١٣٨٩هـ، وتقع المخطوطة في ٢٢٠ ورقة، ٢١ سطراً، ٢١×١٥سم. (العدد ٨٣٢).

ب- حاشية كتبها على شرح علي بن محمد، السيد الشريف (ت٨١٦هـ٩ على الرسالة العضدية في الوضع، لعضدالدين عبدالرحمن بن أحمد الإيجي (ت ٧٥٦هـ). كتب هذه المخطوطة إبراهيم البرزنجي، بخط معتاد، سنة ١١٨٥هـ، وتقع ضمن مجموعة، الأوراق ٤١-٨٢، ٢٥سطراً، ٢١×١٣،٥سم (العدد ٨٨١).

ج- حاشية كتبها على شرح العقائد العضدية لمحمد بن أسعد الصديقي الدواني (ت٩١٨هـ)، والعقائد العضدية للقاضي عضدالدين عبدالرحمن بن أحمد الإيجي (ت ٧٥٦هـ). مزج فيها بين حاشية أبيه المسماة بالمحاكمات، وقد تقدمت، وبين حاشية حسين الخلخالي الحنفي (ت١٠١٤هـ) على الشرح المذكور. وشرح في أوله منهجه بقوله " علقت عليه تعليقات تذلل صعابه، وتميز عن القشر لبابه، تتمة لما أهملتاه، وتبينة لما أجملتاه، وتكون كالحاشية للحاشيتين". والنسخة بخط معتاد، فرغ منها في قرية ماوران من ناحية صهران (سوران) في يوم الأحد من شهر ربيع الأول سنة ١٠٩٧هـ، وتقع في ٦٨ ورقة، ٢١ سطراً، ٢١،٥×١٦سم. (العدد ٥٧١)

١٠- عبد الله بن حيدر بن أحمد الحيدري (ت ١١٠٧هـ)[١٥]، من علماء ماوران، له في المكتبة:

أ- نبذ في الحساب والهيئة مذيلة باسمه في مجموعة (العدد ١٢٨٧) .

ب- حاشية على شرح إبراهيم الأسفرائيني (ت ٩٤٤هـ) على رسالة الاستعارات لأبي القاسم السمرقندي الليثي (ت بعد ٨٨٨هـ). نسخة بخط صالح بن ملا سليمان، في الموصل، فرغ منها في شهر صفر سنة ١٢٧٦هـ، وتشغل الأوراق ٩١-١١٣، ١٩ سطراً، ٢١×١٥سم من المجموعة ذات (العدد ١٤٤٠).

ج- حاشية على حاشية قول أحمد بن محمد بن خضر (ت ٩٥٠هـ) على الفوائد الفنارية، لمحمد بن حمزة الفناري (ت٨٣٤هـ)، وهو شرح كتاب

